حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# زمان و ئەدەبی کوردی

## پۆلی دوازدەهەمی ئامادەیی



چاپی چواردەهەم

١٤٤٠ کۆچی ٢٠١٩ زایینی ٢٧١٩ کوردی

## دانانی

عبـــدالله شــالی | د.عزالـــدین مصطــفی | د.امیــــــن علـــي

نوری علي امــین | فریــدون علــي امــین | علاءالدين سجادي

## پێداچوونەوەی زانستی دووەم

محسن علي حسين | فاروق نورالدين ئاغۆك | عمر أحمد خـدر

نەمام جـلال رشـيد | ئەختەر صديق حسين | صادق احمد عثمان

**سەرپەرشتی زانستی چاپ:** صادق احمد عثمان

نەمام جلال رشيد

**سەرپەرشتی هونەری چاپ:** عوسمان پیرداود کواز

ئاری محسن احمد

**نەخشەسازی بەرگ و ناوەرۆك:** ئاری محسن احمد

**تایپکردن:** يوسف احمد اسماعیل

ڕێڤین راغب حسين

لانه مجيد میریحیی

# پێشەکی

مامۆستایانی بەڕێز، کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی پۆلی دوازدەهەمی ئامادەیی، دانانی بۆ زیاتر لە چل ساڵ بەر لە ئێستا دەگەڕێتەوە، لە چوار بەش (ڕێزمان، ئەدەب، ڕەوانبێژی و خوێندنەوە) پێکهاتووە، تەنها یەکجار لە لایەن لیژنەیەکی پسپۆر لە ساڵی(٢٠٠٧)ز بژارکراوە و پێداچوونەوەی زانستی بۆ کراوە و دەوڵەمەندکراوە.

بێگومان پرۆگرامی خوێندن پێویستی بە گەشەپێدان و پێداچوونەوەی بەردەوام هەیە، چونکە سیستەمی خوێندنی زمان و ئەزمونەکان و وانەگوتنەوە گۆڕاوە، لە ڕوانگەی ئەو دید و بۆچوونە و بە مەبەستی گونجاندن و ئاسانکاری لیژنەیەکی پسپۆر لە لایەن وەزارەتی پەروەردە بۆ ئەم مەبەستە ڕاسپێردرا.

لە بەشی ڕێزمان چەندین گۆڕانکاریکراوە و ڕاهێنانی هەڵبژاردن بۆ هەموو بابەتەکان زیادکراوە. بەشی ئەدەب پوختەکراوە. لە بەشی ڕەوانبێژی پێناسەکان بە زمانێکی سادەتر داڕێژراونەتەوە و نمونەی ڕوونتر و جوانتر لە شوێنی نمونە لێڵەکان دانراون. لە بەشی خوێندنەوە بەچاکمان زانیووە بابەتەکان کەمبکەینەوە. هەوڵمانداوە سەرجەم بەشەکانی کتێبەکە، لەڕووی زمانەوانی و ڕێنووسەوە هەڵەبڕبکەین.

هەروەها دیزاینێکی جوانی بە بەرگێکی قەشەنگ بۆ کراوە. داوا لەپسپۆڕانی زمانی کوردی لە مامۆستا و سەرپەرشتیاران دەکەین، لە هەر تێبینی و ڕەخنە و پێشنیازێک کە هەیانە ئاگادارمانبکەنەوە بۆ ئەوەی لە چاپەکانی ئایندەدا لەبەرچاویانبگرین.

لیژنەی پێداچوونەوە

٢٠١٩/٨/٢٠

# پێڕست

## بەشی ڕێزمان 7

### وەرزی یەکەم:



### وەرزی دووەم:

## بەشی ئەدەب ٩٥

### وەرزی یەکەم



### وەرزی دووەم

## بەشی ڕەوانبێژی ١٥١



## بەشی خوێندنەوە ١٧٣



## سەرچاوەکان ١٨٤

## کاربەپێی ناوەرۆك چوار شێوازی* هەیە

### ١- شێوازی ڕێژەی ڕاگەیاندن

١- کارەکەی تۆمان دواخست.
٢- هاوکار قەڵەمەکەی بەخشیوە.
٣- هەموو بۆ بینینی پێشانگاکە هاتبوون.
٤- کە ئەوان هاتن بۆ ماڵی ئێمە، براکەم دەرگاکەی بۆیەدەکرد.
٥- دۆخی ئافرەتی کورد تایبەتمەندییەکانی گەلی کورد دەنوێنێت.
٦- خانووەکەتان نەفرۆشرا.
٧- ڕاسپاردەکە بە ئەوان جێبەجێناکرێت.

لەم ڕستانەی سەرەوەدا (دواخست، بەخشیوە، هاتبوو، هات، بۆیەدەکرد، دەنوێنێت، نەفرۆشرا، جێبەجێناکرێت) هەموویان واتاکانیان هەواڵێک ڕادەگەیێنن و دەردەخەن لە دەمێکدا، لە هەموو ئەم ڕێژانەدا لەوە بە گومان نین، کە واتای کارەکە گەیشتووەتە ئەنجام، واتا ڕوویانداوە یان ڕوودەدەن یان ڕونادەن، ئەم جۆرە ڕێژانە کە بۆ گەیاندنی چەمکی هەواڵێک بەکاردەهێنرێن، شێوازی ڕێژەی ڕاگەیاندنی کارن.
ئەو ڕێژانەی (کار) کە لە شێوازی ڕاگەیاندندا بەکاردەهێنرێن ئەمانەن:

#### یەکەم: ڕێژەی ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندن:

ئەم ڕێژەیە لە چاوگەکان، بە لابردنی (ن) نونی چاوگ لە چاوگەکە دروستدەکرێت، وەک کاری (دواخست)، کە لە ڕستەی یەکەمدا پیشاندراوە.

#### دووەم: ڕێژەی ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندن:

قەدی چاوگ لەگەڵ نیشانەی ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندن (وە، ووە)** دروستدەکرێت، وەک کاری (بەخشیوە) کە لە ڕستەی دووەمدا پیشاندراوە.

(*) شێواز/ اسلوب
(**) لە ڕێژەی ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندندا نیشانەی (ووە) بۆ ئەو کارانە بەکاردێت کە قەدەکانیان کۆتایی بە پیتی (د، ت) هاتووە، نیشانەی (وە) بۆ قەدی ئەو کارانە بەکاردێت کە کۆتاییان دێت بە بزوێنەکانی (ا ، ی ، وو).
لە زاری کرمانجیی سەروودا لەجیاتی نیشانەی (وە) نیشانەی (یە) و لەجیاتی (ووە) نیشانەی (ییە)، لە ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندندا بەکاردێت، وەک: هێناوە ← هێنایە چاندووە ← چاندییە

## سێیەم ڕێژەی ڕابردووی دووری ڕاگەیاندن:

قەدی چاوگ لەگەڵ نیشانەی ڕابردووی دووری ڕاگەیاندن (بوو) دروستدەکرێت. وەک کاری (هاتبوو)، کە لە ڕستەی سێیەمدا پیشاندراوە.

## چوارەم ڕێژەی ڕابردووی بەردەوامی ڕاگەیاندن:

قەدی چاوگ نیشانەی (دە)ی دەخرێتە بەردەمی بۆ دروستکردنی ڕێژەکە ئەگەر کارەکە سادە یان ناسادە بێت، وەک کاری (بۆیەدەکرد)، کە لە ڕستەی چوارەمدا پیشاندراوە.

لە کرمانجیی سەروو.

- (د + قەد): (د + هات) ⟵ دهات

## پێنجەم ڕێژەی ڕانەبردووی ڕاگەیاندن:

ڕەگی کار نیشانەی ڕێژەی ڕانەبردووی ڕاگەیاندن (دە) دەخرێتە بەردەمی ڕەگی کارەکە ئەگەر سادە یان ناسادە بێت ئینجا جێناوە کەسییە لکاوەکان دەنووسرێن، کە ئەمانەن: {م ، ین ، یت ، ن ، (ات ، ێت) ، ن}.

(دە + ڕەگی کار + جێناوی کەسیی لکاو)* وەک کاری (دەنوێنێت) کە لە ڕستەی پێنجەمدا پیشاندراوە.

هەروەها دەبێت ئاماژە بەوە بکرێت کە لە شێوازی ڕێژەی ڕاگەیاندندا:

١- کاری بکەرنادیار بەکاردەهێنرێت.

٢- لە ڕێژەی کاری ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندندا، ئەگەر کاری ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندن کۆتایی بە پاشگری (ەوە) هاتبوو، ئەوا ناوبەندی (ت) دەخرێتە نێوان نیشانەی ڕابردووی تەواو و پاشگرەکەوە:

- خوێندووە ⟵ خوێند + وو + ت + ەوە
- دۆزیوە ⟵ دۆزی + وە + ت + ەوە

* لە کرمانجیی سەروودا لە جیاتی نیشانەی(دە) نیشانەی (د) بۆ ئێستا و (دێ) بۆ داهاتوو بەکاردێت.
د + چم ⟵ دچم ، دێ + چم ⟵ دێچم

٣- ڕێژەکانی شێوازی ڕاگەیاندن لە شێوەی (ئەرێ)وە دەکرێن بە نەرێ:

**أ-** هەموو ڕێژەکانی ڕابردووی ڕاگەیاندن بە کاری بکەردیـار و بکەرنادیارەوە بە ئامرازی (نـە) نەرێ دەکرێن، وەک:

- بوو ← نەبوو
- فرۆشرا ← نەفرۆشرا
- وەرگرت ← وەرنەگرت

**ب-** ڕێـژەی ڕانەبـردووی ڕاگەیاندن بـە کاری بکەردیار و نادیارەوە بە ئامـرازی (نا) نەرێ دەکرێت، لە شـوێنی نیشـانەی (دە) دادەنرێت وەک:

- دەبێت ← نابێت
- ئاوەداندەکەنەوە ← ئاوەداننناکەنەوە
- دەنووسرێ ← نانووسرێ

## دەسـتور

هەندێ ڕێژەی کار بۆ خەبەردان ڕاستەوخۆ لە کار و حاڵی کەسێک یان شتێک بەکاردەهێنرێت و گومان لەوەدا نییە، کە کارەکە گەیشتووەتە ئەنجام یان نەگەیشتووە، بـەم ڕێژانـەی کار دەگوترێـت (شـێوازی ڕاگەیانـدن).



## ڕاهێنان - ١

**لەم چاوگانە ڕێژەی ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندن و ڕێژەی ڕابردووی بەردەوامی ڕاگەیاندن دروستبکە:**

(ڕامالّین، پەڕینەوە، ئازادکردن)

## ڕاهێنان - ٢

**ئەم ڕستانە شیبکەوە:**

١- شڤان ل بن کەپرێ نڤستییە.

٢- شاناز ڕایەخەکەی چنی.

٣- گوندەکان ئاوەداندەکرێنەوە.

## ڕاهێنان - ٣

**وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:**

١- ئەو لە تاقیکردنەوەکەدا سەردەکەوت. کاری (سەردەکەوت) لە ڕێژەی

ئـ- ڕابردووی دووری ڕاگەیاندن    ب- ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندن

پ- ڕانەبردووی ڕاگەیاندن    ت- ڕابردووی بەردەوام

٢- ڕاسپاردەکە جێبەجێدەکرێت. کاری ڕستەکە نەرێ دەکرێ  بە ئامرازی

ئـ- نی    ب- نە    پ- نا    ت- مە

٣- کام لەمانە کاری ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندنە لە چاوگی (خولانەوە)؟

ئـ- خولاوەتەوە    ب- خولایتەوە    پ- دەخولایەوە    ت- خولایەوە

٤- ڕێژەی ڕابردووی بەردەوامی ڕاگەیاندن دروستدەکرێت بە دەستوری

ئـ- دە + ڕەگ    ب- قەد + بوو    پ- دە + قەد    ت- قەد + وە

٥- لە چاوگی (شوشتن) ڕانەبردووی ڕاگەیاندن بریتییە لە

ئـ- دەشوات    ب- دەیشوشت    پ- نەیدەشوشت    ت- دەیانشوشت

## ڕاهێنان - ٤

**لە ڕستەی (هۆنراوەکانیان لەبەرکرد، ئینجا چوون بۆ قوتابخانە).**

١- هەردوو کار لە چ ڕێژەیەکدان؟

٢- لە کاری (لەبەرکرد) ڕێژەی ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندن دروست بکە و لە ڕستەی تر بەکاری بهێنە.

٣- لە هەردوو کار ڕێژەی ڕابردووی بەردەوامی ڕاگەیاندن دروست بکە و ڕستەکە بنووسەوە.

٤- لە هەردوو کار، ڕێژەی ڕانەبردووی ڕاگەیاندن دروست بکە و ڕستەکە بنووسەوە.

٥- وشەی (هۆنراوەکان) شیبکەوە.

## ٢- شێوازی ڕێژەی دانانی

أ-

١- بریا بۆ ئاهەنگەکە چووباینەوە.

٢- ڕەنگە لە ژوورەکەدا خەوتبێتن.

٣- کاشکی چووبووبام و گلەییم نەهێنابایە سەرخۆم.

ب-

١- بریا نانەکەت خواردبا.

٢- لەوانەیە خانووەکەیان کڕیبێت.

٣- دەبوو بارەکەتان ئامادەکردبا پاشان چووبان بۆ هەولێر.

٤- خۆزگە کەپرەکەی دروستکردبووبا.

٥- خۆزی من خانییەك ئاڤاکربا.

پ-

١- دەبێت منداڵەکانمان جوان پەروەردەبکەین.

٢- دەمەوێت لە تاقیکردنەوەکاندا سەربکەویت.

ئەگـەر بڕوانینـە ئـەو کارانـەی کە لەو ڕسـتانەی سـەرەوەدا هەن دەبینیـن، ڕێژەی ئـەم کارانـە وەک ڕێژەکانی کاری ڕاگەیاندن ڕاسـتەوخۆ ئەنجامی هەواڵێـک کە دەدرێتە پاڵ کەسـێک یان شـتێک نـادەن بە دەسـتەوە، بەڵکو لە شـێوەی (گومان، مەبەسـت، ئـارەزوو، ئاوات.....)ە.

لەگـەڵ ڕێژەکانـی شـێوازی دانانیـدا هەندێـک کاری یاریـدەدەر و هەندێـک وشـە بەکاردێـن: (دەبێت، دەبوو، دەبوایە، بریا، خۆزگە، ڕەنگە ...) کە هەواڵەکە دەدەن بەدەسـتەوە، گومـان لـە بـە ئەنجامگەیاندنـی کارەکە هەیـە. لەکاتی گۆڕینی ڕسـتەی دانانی بۆ شـێوازی ڕاگەیانـدن یـان داخـوازی ئـەم کار و وشـانە لادەبرێـن و پێچەوانەش ڕاسـتە.

## تێبینی - ١ -

### لەکاری بکەرنادیار:

شـێوازی ڕێـژەی دانانـی، کارەکان لـە شـێوەی (کاری بکەرنادیار)یـش دروسـتدەکرێت بـــۆ نمـونـــە:

(ڕابردوو ← ڕەگی کار + را + با) **خۆزگە نامەکە نووسرابا.**

(ڕانەبردوو ← ب + ڕەگی کار + رێ) **ڕەنگە نامەکە بنووسرێ.**

## تێبینی - ٢ -

### کارە یاریدەدەرەکان:

(دەبـوو – دەبـوایە – دەبێـت – پێویســتە – دڤێت) بۆ پێویستی بەکاردێت.

دەمەوێت: بۆ ویسـتن بەکاردێت.

دەتوانن: بۆ تـــوانین بەکاردێت.

چێدبیت: بۆ گومان بەکاردێت.

## تێبینی - ٣ -

### وشــەکان:

خۆزگە (خۆزی) – بریا – کاشکێ: بۆ ئاوات و ئارەزوو بەکاردێت.

بەلکی – ڕەنگــە – لـەوانەیە : بۆ گومان بەکاردێت.

خـــوایە : بۆ نزاو پاڕانەوە بەکاردێت.

## "دروستکردنی ڕێژەکانی شێوازی دانانی بەم شێوانەی لای خوارەوە دەبێت:"

### أ ڕێژەی ڕابردووی نزیکی دانانی

قـەدی چـاوگ + بـا

کەوتبا – هێنابا – وەرگرتبا – ئامادەکردبا

### ب ڕێژەی ڕابردووی تەواوی دانانی

قـەدی چـاوگ + بێت

کەوت + بێت = کەوتبێت.

هێنا + بێت = هێنابێت.

هەڵبژارد + بێت = هەڵبژاردبێت.

یارمەتی دا + بێت = یارمەتیدابێت.

### پ ڕێژەی ڕابردووی دووری دانانی

قـەدی چـاوگ + بووبا

هێنابووبا – کەوتبووبا – وەرگرتبووبا – ئامادەکردبووبا...

### ت ڕێژەی ڕانەبردووی دانانی

بـ + ڕەگی کار + جێناوی کەسی لکاو

بنووسـم ـ بچێت ـ بخـۆین ـ پـەروەردەبکـەین ـ سـەربکەویت*.

لێـرەدا ئامـاژە بـەوە دەکەین کە (بـا، بێت، بووبا، ب) نیشـانەن لە شـێوازی دانانیدا، هەروەهـا هەمـوو ڕێژەکانی شـێوازی دانانـی بە ئامرازی (نـە) نەرێدەکرێن، ئەگـەر کارەکە لـە دەمـی ڕابـردوو بـوو، دەکەوێتە پێـش کارەکە.

(*) ڕێـژەی ڕانەبـردووی دانانـی هەروەک ڕێـژەی ڕانەبـردووی ڕاگەیاندنە تەنیا نیشـانەی (دە) دەگۆڕین بـۆ (ب). هەروەهـا دەکرێـت دەرنەکەوێت، ئەگەر کارەکە ناسـادە بوو.

بـەڵام ئەگەر لـە دەمی ڕانەبردووی دانانی بوو، ئامرازی (نە) شـوێنی نیشـانەی (ب) دەگرێتـەوە. وەک:

هاتبا ← نەهاتبا

دەرچووبێت ← دەرنەچووبێت

هێنابووبا ← نەهێنابووبا

بنووسم ← نەنووسم

## دەستور

ئـەو ڕێژەیەی کارە ڕاسـتەوخۆ ئەنجامی ئەو هەواڵەی کە دەیداتە پاڵ کەسـێک یـان شـتێک نایدات بە دەسـتەوە، بەڵکو لەشـێوەی گومـان، ئارەزوو، ئـاوات، پاڕانەوە یـان مەبەسـتدا واتاکـەی دەردەکەوێت.



## ڕاهێنان - ١

**ڕێژە و شێوازی کارەکانی ئەم ڕستانە دیاربکە؟**

١- سا خوایە هەڵبکەی کزەی شەماڵێ
هەرای زەنگی غەم لە دڵ بماڵـــێ

٢- کاشکی دیتبام و کتێبەکەم لێ وەرگرتبا.

٣- ڕەنگە زوو هاتبێتن و زوو ڕۆیشتبێتن.

٤- بریا کوردستان زیاتر پێشکەوتبا.

## ڕاهێنان - ٢

**لە ڕستەی (دەبێت ژینگە بپارێزین).**

١- (دەبێت) چ جۆرە کارێکە ؟ چی دەگەیەنێت؟

٢- (بپارێزین) لە چ ڕێژەیەکدایە؟ چۆن دروستکراوە؟

٣- لە کاری(بپارێزین) ڕێژەی ڕابردووی نزیکی دانانی دروستبکە؟

٤- کاری (بپارێزین) بدە پاڵ جێناوە لکاوەکانی دووەمی تاک و سێیەمی کۆ.

٥- شێوازی ڕستەکە بگۆڕە بۆ شێوازی ڕاگەیاندن.

## ڕاهێنان - ٣

**وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:**

١- ڕێژەی ڕابردووی تەواوی دانانی بە کام دەستور دروست دەبێت؟

ئـ- قەدی چاوگ + ووە        ب- قەدی چاوگ + با

پ- قەدی چاوگ + بێت        ت- ب + ڕەگی کار + جێناو

٢- خانووەکەیان کڕیوە. ئەم ڕستەیە بگۆڕین بۆ شێوازی دانانی دەبێتە:

ئـ - خانووەکەیان کڕیبێت        ب- خانووەکەیان کڕیبا.

پ- خۆزگە خانووەکەیان کڕیبێت        ت- بریا خانووەکەیان کڕیبا.

٣- ڕێژەی ڕانەبردووی دانانی دەکرێتە نەرێ بە ئامرازی:

ئـ- نا ب- مە پ- نی ت- نە

٤- لە ڕستەی (خۆزگە چووبا بۆ گەشت)، وشەی (خۆزگە) بۆ چ مەبەستێک بەکارهاتووە؟

ئـ- ئاوات ب- گومان پ- پێویستی ت- پاڕانەوە

٥- لە ڕستەی (دەمەوێت لە تاقیکردنەوە سەربکەون). کاری (سەربکەون) لە چ ڕێژەیەکدایە؟

ئـ - ڕانەبردووی دانانی ب- داخوازی

پ- ڕانەبردووی ڕاگەیاندن ت- ڕانەبردووی دانانی و داخوازی

## ڕاهێنان - ٤

**ئەم ڕستانەی خوارەوە شیبکەوە:**

١- خۆزگە باران باریبا.

٢- دەبێت چیرۆکەکە بخوێنیتەوە.

## ٣- شێوازی ڕێژەی داخوازی

**/١**

| (ب) | (أ) |
| --- | --- |
| لێکۆڵینەوەکە مەنووسە. | لێکۆڵینەوەکە بنووسە. |
| کتێبەکە هەڵمەگرە. | کتێبەکە هەڵبگرە. |
| لەگەڵ فرۆشیارەکە ڕێکمەکەوە. | لەگەڵ فرۆشیارەکە ڕێکبکەوە. |

**/٢**

| | |
| --- | --- |
| گۆڤارەکە مەکڕن. | گۆڤارەکە بکڕن. |
| لە ژوورەوە دامەنیشن. | لە ژوورەوە دابنیشن. |
| شانۆگەرییەکە پێشکەشمەکەن. | شانۆگەرییەکە پێشکەشبکەن. |

**/٣**

| | |
| --- | --- |
| نانەکە مەخۆ. | نانەکە بخۆ. |
| قەڵەمەکە دامەنێ. | قەڵەمەکە دابنێ. |
| منداڵەکە بانگمەکە. | منداڵەکە بانگکە. |

ڕێژەی داخوازی، فەرمان و داوا و ورياکردنەوەيە بۆ بەجێهێنان يان بەجێنەهێنانی کارێک، لەلايەن کەسی دووەمی تاک، يان کەسی دووەمی کۆ.

ئەم ڕێژەيە نيشانە و پێکهاتنی تايبەتی خۆی هەيە، کەرەستەی پێکهاتنی بريتييە لە: نيشانەی کار (ب) ڕەگی کار و جێناوی لکاو، (ە) بۆ کەسی دووەمی تاک و (ن) بۆ کەسی دووەمی کۆ بەکاردێت.

ئەگەر سەرنج بدەينە ڕێژەی ئەو کارانەی لە ڕيزی ژمارە (١) بەشی (ئـ) پيشاندراون (بنووسە ـ هەڵبگرە ـ ڕێکبکەوە) دەبينين داوا لە کەسی دووەمی تاک دەکرێت، کە کارێک بە ئەنجام بگەيەنێت، بەڵام لە ڕستەکانی بەشی (ب) (مەنووسە ـ هەڵمەگرە ـ ڕێکمەکەوە) داوا لە کەسی دووەمی تاک بکرێت بۆ نەکردنی کارێک کە بەهۆی ئامرازی (مە)وە نەرێکراوە.

هەروەها ئەگەر سەرنج بدەینە ڕێژەی ئەو کارانەی کە لە ڕیزی ژمارە (٢) بەشی (ئـ) پیشاندراون، کە بریتین لە (بکڕن ـ دابنیشن ـ پێشکەشبکەن) داوا لە کەسی دووەمی کۆ دەکرێت بۆ کردنی کارێک، هەروەها ڕستەکانی بەشی (ب) (مەکڕن ـ دامەنیشن ـ پێشکەشمەکەن) داوا لە کەسی دووەمی کۆ دەکرێت بۆ نەکردنی کارێک، کە بەهۆی ئامرازی (مە) نەرێکراوە.

هەروەها ئەو کارانەی ڕەگی کاریان کۆتایی بە پیتی (نەبزوێن) هاتووە، ئەوا لە ڕێژەی داخوازیدا بەئاسانی جێناوی کەسی لکاو (ە) یان (ن) وەردەگرێت وەک لە ڕستەکانی ژمارە (١، ٢) پیشاندراون، بەڵام ئەگەر ڕەگی کارەکە کۆتایی بە پیتی (بزوێن) هاتبوو ئەوا جێناوی لکاوی (ە)ی کەسی دووەمی تاک دەرناکەوێت، چونکە لە زمانی کوردیدا دوو بزوێن بەدوای یەکدا نایەن* بەڵام جێناوی لکاوی کەسی دووەمی کۆ دەردەکەوێت، وەک لە ڕستەکانی ڕیزی ژمارە(٣)دا لەباری (ئەرێ و نەرێ)دا پیشاندراون.

شایانی باسە ئەگەر کارەکە لە ڕووی دارشتنەوە (ناسادە) بێت، لەکاتی ئاخاوتن و وتندا بەزۆری نیشانەی کار (بـ) دەرناکەوێت، بەڵام چاکتر وایە لە کاتی نووسیندا بنووسرێت، وەک:

وەربگرە ـ وەرگرە

سەربخە ـ سەرخە

فریابکەوە ـ فریاکەوە

ڕاببە ـ ڕابە

* چاوگی(هاتن) ڕەگەکەی (هێ)یە بۆ سوککردن دەبێتە (ێ) کاری داخوازی بەپێی دەستور دەبێتە(بێ – بێن) لێرەدا (ە) جێناوی کەسی دووەمی تاک دەرناکەوێت. هەر لەم چاوگە بەبێ دەستور ڕێژەی داخوازی دەبێتە(وەرە – وەرن).

– چاوگی(چوون) ڕێژەی داخوازی بۆ کەسی دووەمی تاک لە دەستور لادەدات و دەبێتە (بچۆ)

– لە کرمانجیی سەروو کاری (هەڕە) لە دەستوور لایداوە.

## دەسـتور

ڕێژەی داخوازی، ئەو ڕێژەیەیە کە قســەکەر بەشــێوەی داوا و فەرمان، داوا لە کەسـی دووەمــی تاک، یــان دووەمی کۆ دەکات بۆ بەجێهێنان یــان بەجێ نەهێنانی کارێک.
بۆ دارِشــتنی کاری داخــوازی، ڕەگی کاری ڕانەبردوو وەردەگیرێ و نیشــانەی (بـ) لە پێشــییەوە دادەنرێــت و جێنــاوی کەســی لکاو (ە) بۆ کەســی دووەمی تــاک و (ن) بۆ کەســی دووەمی کــۆ لە دواوە پێــوە دەلکێنرێت*.

بـ + ڕەگی کار +

ە : جێناوی لکاوە بۆ کەسی دووەمی تاك

ن: جێناوی لکاوە بۆ کەسی دووەمی کۆ

| چاوگ | ڕەگی کار | ڕێژەی داخوازی |
|---|---|---|
| فرۆشتن | فرۆش | بفرۆشە ، بفرۆشن |
| داگرتن | داگر | دابگرە ، دابگرن |

(*) جێنــاوی لـکاوی (ە ــ ن) لــە کاری داخوازی (تێپەڕ ــ تێنەپەڕ)ی (ســادە و ناســادە) دەبــن بە بکەر و دەچنــە دوای ڕەگی کارەکە.

## ڕاهێنان - ١

**لەم ڕستانەی خوارەوەدا ئەو کارانەی بۆ شێوازی داخوازی بەکارهاتوون دەربهێنە:**

١- پەخشانەکە بخوێنەوە.

٢- ڕاستی بڵێ.

٣- پەرلەمانی کوردستان بپارێزن.

٤- دیمانەکە پەخشبکە.

٥- وێنەکە مەشێوێنە.

## ڕاهێنان - ٢

**ئەم ڕستانەی خوارەوە شیبکەوە:**

١- گۆڤارەکان چاپبکەن.

٢- پەخشانەکە بڵاوبکەوە.

٣- بەخۆشی بژی.

## ڕاهێنان - ٣

**وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:**

١- (منداڵەکە جوان پەروەردەبکە). لەم ڕستەیەدا چی دەرنەکەوتووە؟

ئـ- جێناوی لکاو(ن)　ب- جێناوی لکاو(ە)　پ- نیشانەی کار　ت- بەرکار

٢- لە کام لەم کارە داخوازییانە، جێناوی لکاوی (ە) دەرنەکەوتووە؟

ئـ- بنوو　ب- لادە　پ- بکە　ت- هەموویان

٣- کامیان کاری داخوازییە و لە چاوگی (بوون) دروستکراوە؟

ئـ- ببەن　ب- ببن　پ- بێ　ت- بێن

٤- لە کام لەم کارە داخوازیانە دەگونجێت نیشانەی کار لاببرێ؟

ئـ- بهێنە ب- بخوێنەوە پ- دابنیشەوە ت- بهۆنەوە

٥- (بە ئازادی بژی). کاری ڕستەکە بکەیتە دانانی دەبێتە:

ئـ- بژییت ب- بژییێت پ- بژیت ت- بژین

## ڕاهێنان - ٤

**لە ڕستەی (پڕۆژەکە تەواوبکە).**

١- کوا بکەری ئەم ڕستەیە؟

٢- ئایا دەتوانیت نیشانەی (بـ) لە کارەکە بەکارنەهێنیت؟ چۆن؟

٣- وشەی (پڕۆژەکە) شیبکەوە.

٤- شێوازی ڕستەکە بکە بە شێوازی دانانی.

## ٤- شێوازی مەرجی
## (ڕستەی ئاوێتەی مەرج)

١- ئەگەر یەکبگرین، سەردەکەوین.

٢- هەتا ڕەنج نەکێشیت، گەنج نانۆشیت.

٣- کە ڕاپەڕین بەرپابوو، بە ئامانج گەیشتین.

٤- کەی بایەخ بە پیشەسازی بدرێت، وڵات پێشدەکەوێت.

٥- ئەگەر نەورۆز هات، ئەم دێچینە سەیرانێ.

٦- کەی چوویت بۆ کتێبخانە، گۆڤارەکە ببەوە.

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەو ڕستانەی سەرەوە و چاوێک بە ڕیژەی کارەکان بخشێنین، کە تیایاندا بەکارهێنراون، دەبینین هەر ئەو کارانەن کە لە شێوازی ڕاگەیاندن یا دانانی یا داخوازی بەکارهێنراون، بەڵام مەبەست لەم ڕستانەدا گۆڕاوە، واتە کارەکان بۆ مەبەستی بنجی خۆیان کە (ڕاگەیاندن، دانانی، داخوازی)یە بەکارنەهێنراون، بەڵکو بۆ مەبەستی مەرج بەکارهێنراون.

ئینجا ئەگەر سەیری ڕستەکان بکەین، دەبینین. لە ڕستەی یەکەمدا کاری (یەک بگرن) ڕیژەکەی ڕانەبردووی دانانییە، کاری (سەردەکەوین) ڕیژەکەی ڕانەبردووی ڕاگەیاندنە ئەمە لە ڕووی ڕیژەوە، بەڵام لە ڕووی ناوەرۆکەوە هەردووکیان لەم شوێنەیاندا بۆ مەبەستی مەرج بەکارهێنراون.

واتە ڕودانی کاری (یەک بگرین) مەرجە بۆ ڕودانی کاری (سەردەکەوین).

لە ڕستەی دووەمدا کاری (ڕەنج نەکێشیت) ڕیژەکەی ڕانەبردووی دانانییە، کاری (گەنج نانۆشیت) ڕیژەکەی ڕانەبردووی ڕاگەیاندنە، ئەمە لە ڕووی ڕیژەوە بەڵام لە ڕووی ناوەرۆکەوە هەردووکیان لەم شوێنەیاندا بۆ مەبەستی مەرج بەکارهێنراون. واتە ڕودانی کاری ڕەنج نەکێشیت مەرجە بۆ ڕودانی کاری گەنج نانۆشێت.

لە ڕستەی سێیەمدا کاری (بەرپابوو) ڕیژەکەی ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندنە، کاری (گەیشت) ڕیژەکەی ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندنە ئەمە لە ڕووی ڕیژەوە بەڵام لە ڕووی

ناوەرۆکـەوە هەردووکیـان لـەم شـوێنەیاندا بۆ مەبەسـتی مـەرج بەکارهێنـراون، بۆیە بەم شـێوانەی ڕێـژەی کار لـە بەکارهێنانـدا دەگوترێ شـێوازی مەرج.

لـە ڕسـتەی چوارەمدا کاری (بایـەخ بدرێت) ڕێژەکـەی ڕانەبـردووی دانانییە، کاری (پێشـدەکەوێت) ڕێژەکـەی ڕانەبـردووی ڕاگەیاندنـە ئەمـە لـەروی ڕێژەوە بـەڵام لە ڕووی ناوەرۆکـەوە هەردووکیان لەم شـوێنەیاندا بۆ مەبەسـتی مەرج بەکارهێنـراون. واتە ڕودانی کاری (بایەخبدرێـت) مەرجـە بـۆ ڕودان و ئەنجامدانـی کاری (پێشـدەکەوێت). بۆیـە بـەم شـێوانەی ڕێـژەی کار لـە بەکارهێنانـدا دەگوتـرێ شـێوازی مەرج.

لـە ڕسـتەی پێنجەمـدا کاری (هـات) ڕێژەکـەی ڕابـردووی نزیکـی ڕاگەیاندنەکاری (دێچیـن) ڕێژەکـەی ڕانەبـردووی ڕاگەیاندنـە، ئەمـە لـە ڕووی ڕێـژەوە، بـەڵام لـە ڕووی ناوەرۆکـەوە هەردووکیان لەم شـوێنەیاندا بۆ مەبەسـتی مەرج بەکارهێنـراون. واتە ڕودانی کاری (هـات) مەرجـە بـۆ ڕودان و ئەنجامدانـی کاری (دێچیـن). بۆیە بەم شـێوانەی ڕێژەی کار لەبـەکار هێنانـدا دەگوتـرێ شـێوازی مەرج.

لەڕسـتەی شەشـەمدا کاری (چـوو) ڕێژەکەی ڕابـردووی نزیکـی ڕاگەیاندنە، کاری (ببەوە) ڕێژەکەی داخوازییە، ئەمە لە ڕووی ڕێژەوە بەڵام لە ڕووی ناوەرۆکەوە هەردووکیان لـەم شـوێنەیاندا بۆ مەبەسـتی مـەرج بەکارهێنراون. واتـە ڕودانی کاری (چـوو) مەرجە بۆ ڕودانی کاری (ببەوە). بۆیە بەم شێوانەی ڕێژەی کار لەبەکارهێناندا دەگوترێ شێوازی مەرج.

کەواتە لەم ڕستانەی سەرەوەدا ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە:

١- ڕسـتەی شـێوازی مەرجی هەمیشە ڕسـتەیەکی ئاوێتەی مەرجە و لە دوو ڕستەی سادە پێکهاتووە.

ئ- ڕستەی کاری مەرج یا پاڕستە.

ب- ڕسـتەی وەڵامـی مـەرج کـە ڕسـتەیەکی سـەرەکییە و مەبەسـتەکە لـەم ڕسـتەیە دەردەکەوێـت. هەروەهـا پێیدەگوترێـت شاڕسـتە.

٢- لە ڕسـتەی ئاوێتەی مەرجدا (ڕسـتەی شێوازی مەرجیدا) کـار ڕێژەی تایبەتی خۆی نییە، بەڵـکو هەر ئـەو کارانەن کە لە شێوازی (ڕاگەیاندن، دانانی، داخوازی) بەکارهێنراون بەڵام لێرەدا بۆ مەبەسـتی بنجی خۆیان بەکارنەهێنراون، بەڵکو بۆمەبەستی مەرج بەکار هێنراون.

٣- لەڕسـتەی کاری مەرج (پاڕسـتە) ڕێژەی کار هەمیشـە (ڕاگەیاندنە یا دانانییە)، لە ڕستەی وەڵامی مەرجیشـدا ( شاڕستە) ڕێژەی کار هەمیشـە (ڕاگەیاندنە یا داخوازییە).

٤- لە ڕســتەی ئاوێتەی مەرجدا بەشێوەیەکی گشتی ڕستەی کاری مەرج دەکەوێتە سەرەتای ڕســتە، بەڵام دەگونجێ هەندێ جار ڕســتەی وەڵامی مەرج بکەوێتە سەرەتای ڕستە. وەک:

دەچین بۆ سەیران، کە نەورۆز هات.

کانیاوەکان دەبوژێنەوە، ئەگەر باران ببارێت.

٥- لــە ڕســتەی ئاوێتەی مەرجدا ئامــرازی لێکدەر (تا، هەتا، کە، هەکە، کــەی، ئەگەر....) پێیان دەگوتــرێ ئامرازی لێکدەری مەرج.

## دەستور

ئــ- ئەگەر لەکاتی بەکارهێنانی کار لە ڕســتەدا ڕودانی کارێــک مەرج بێت بۆ ڕوودانی کارێکــی تــر، لــەو بارەیدا بــەو کارە، بــە ڕێــژەو ناوەرۆکییــەوە دەگوترێ ڕســتەی ئاوێتــەی مەرج (شــێوازی مەرج).

ب: ڕستەی ئاوێتەی مەرج لە دوو ڕستە پێکدێت:

ڕســتەی کاری مەرج، ڕودان و بە ئەنجامگەیاندنی کاری ئەم ڕســتەیە مەرجە بۆ ڕودانی کاری ڕســتەی وەڵامی مەرج.

ڕســتەی وەڵامی مەرج کە ڕســتەیەکی ســەرەکییە، ڕودان و بــە ئەنجامگەیاندنی کاری ئەم ڕســتەیە بەســتراوەتەوە بە ڕودانی کاری ڕســتەی کاری مەرج.

## ڕاهێنان - ١

**لەڕستەی ئاوێتەی مەرجدا چەند جۆرە کار هەیە؟ لە چ ڕێژەیەکدا دەبن و بۆ چ بەکاردەهێنرێن؟ بە نمونە ڕوونیبکەوە.**

## ڕاهێنان - ٢

**لەڕستەی(زوو برۆ، کارەکە ئەنجامبدە).**

١- هەردوو کار لە چ ڕێژەیەکدان؟

٢- بکەری هەردوو ڕستەکە دیاربکە؟

٣- لـە کاری (برۆ) ڕێژەی ڕابردووی نزیکی دانانی دروسـتبکە و لـە کاری (ئەنجامبدە) ڕێـژەی ڕابـردووی بەردەوامـی ڕاگەیانـدن دروسـتبکە، ئینجا ڕسـتەکە بەشـێوەی ڕسـتەی ئاوێتەی مەرج بنووسـەوە.

## ڕاهێنان - ٣

**وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:**

١- لە شێوازی مەرجیدا کار بە چەند شێواز دەردەکەوێت؟

ئـ- یەک ب- دوو پ- سێ ت- چوار

٢- لە شێوازی مەرجیدا کاری وەڵامی مەرج لە ڕێژەی:

ئـ- ڕاگەیاندن و داخوازییە ب- ڕاگەیاندن و دانانییە

پ- ڕاگەیاندنە ت- دانانی و داخوازییە

٣- کـەی بایـەخ بـە پیشەسـازی بدرێـت، ولات پێشـدەکەوێت. ئەگـەر کاری ڕسـتەی مـەرج بکەینـە نـەرێ ئـەوا دەبێتـە:

ئـ- بایەخنادرێت ب- پێشنەکەوێت پ- بایەخنەدرێ ت- پێشناکەوێت

٤- ئەگەر یارمەتیمان دابان، کارەکەیان تەواودەکرد.

کاری وەڵامی مەرج لە چ ڕێژەیەکدایە؟

ئـ- ڕابردووی نزیکی دانانی ب- ڕابردووی بەردەوامی ڕاگەیاندن

پ- ڕانەبردووی ڕاگەیاندن ت- مەرجی

٥- لە رستەی (تا وانەکان نەخوێنن، نمرەی باش وەرناگرن). کاری وەڵامی مەرج لە چ ڕێژەیەکدایە؟
ئـ- ڕانەبردووی دانانی
ب- داخوازی
پ- ڕانەبردووی ڕاگەیاندن
ت- ڕابردووی بەردەوام

## ڕاهێنان - ٤

**لەڕستەی (کەی نەورۆز هات، ئاگری خۆشی هەڵدەکەین).**

١- جۆری ڕستەکە دیاربکە.
٢- وشەی (کەی) شیبکەوە.
٣- وشەی (هات، هەڵدەکەین) شیبکەوە.
٤- ئەم ڕستەیە لە چەند ڕستە پێکهاتووە و هەریەکەیان چی پێدەگوترێت؟ ئایا دەتوانین جێیان بگۆڕین؟

## ڕاهێنان - ٥

**نمونەیەك لە شیكردنەوە.(ئەگەر ئەوان هاتبان، کارەکەیان ئەنجامدەدا).**

ئەگەر ئەوان هاتبان: ڕستەی کاری مەرجە.
ئەگەر: ئامرازی لێکدەری مەرجە.
ئەوان: جێناوی کەسی سەربەخۆیە، بۆ کەسی سێیەمی کۆ، بکەرە.
هاتبا: کاری ڕابردووی نزیکی دانانییە، کاری مەرجە، تێنەپەڕە.
ن: جێناوی کەسی لکاوە، بۆ کەسی سێیەمی کۆ، بۆ بکەر دەگەڕێتەوە.
کارەکەیان ئەنجامدەدا: ڕستەی وەڵامی مەرجە
کارەکە: ناوە، تاکە، ناسراوە، بەرکارە.
یان: جێناوی لکاوە بۆ کەسی سێیەمی کۆ، بکەرە.
ئەنجامدەدا: کاری ڕابردووی بەردەوامی ڕاگەیاندنە، کاری وەڵامی مەرجە، لێکدراوە، تێپەڕە.

**تۆش ئەم ڕستانەی خوارەوە شیبکەوە.**

ئـ: کەی بوویت بە ئەندازیار، گوندەکان ئاوەدانبکەوە.
ب: ئەگەر وانەکە باش بخوێنیت، دەردەچیت.

# کاری چاوگی (بوون)

## (أ)
## کاری تەواوی تێپەڕ

### ١- بە مانای خاوەندارێتی:

پارەم هەبوو. پارەم هەیە. پارەم دەبێت.

### ٢- بە مانای منداڵبوون:

نازەنین منداڵی بوو. نازەنین منداڵی دەبێت.

## (ب)
## کاری تەواوی تێنەپەڕ

### ١- بەشێوەی (ناسادە):

| | |
|---|---|
| ١- چراکە هەڵبوو. | هەڵدەبێت. |
| ٢- ئازاد ژ خەو ڕابوو. | ڕادەبێت. |
| ٣- کارەکە تەواوبوو. | تەواودەبێت. |
| ٤- کاوە سووڕبوو لەسەر بڕیارەکەی. | سووڕدەبێت. |

### ٢- بە مانای بوون (وجود):

من هەبووم. کورد هەیە. ئێمە دەبین.

## (پ)
## کاری ناتەواو

**- تەواوکەری ڕاستەوخۆ:**

١- کاوە مامۆستایە.

٢- ئاواتم خوێندن بوو.

٣- یەکەمەکە ئەو دەبێت.

٤- ئاهەنگەکە بەشەو بوو.

٥- هاوینەهەواری شەقڵاوە فێنکە.

**-تەواوکەری بەیاریدە**

١- ڕەنگە ئاوەکە ببێت بە سەهۆڵ.

٢- سەرکەوتن بە تێکۆشانە.

٣- قەڵەمەکەی تۆ بە من بوو.

## (ت)
## کاری یاریدەدەر

١- دەبوو لە گەڵیان چووبام.

٢- دەبوایە ئەوان هاتبووبان.

٣- دەبێت ئەمساڵ دەربچم.

چاوگی (بوون) وەک هەموو چاوگێکی تر، سەرچاوەیە بۆ دروستبوونی دەمەکانی کاری (ڕابردوو، ڕانەبردوو)، کە بریتین لە:



## لە چاوگی بوون ( هەبوون)، چوار جۆر کار دروستدەبێت:

### یەکەم کاری تەواوی تێپەڕ

ئـەو کارانــەی لــە چاوگی (بــوون) پەیدادەبــن، وەک کاری تەواوی تێپەڕ لە ڕســتەدا دەرەکــەون، لــە کاتێکدا ئەگــەر بۆ خاوەندارێتــی (تملک) یان بــۆ منداڵبــوون بەکارهات، ئەو دەمــە دەبنــە کاری تەواوی تێپەڕ لە ڕێــگای بەرکارەکانیانــەوە، ئەرکەکانیــان ئەنجامدەدەن، ئــەم کارانــە لەبنەڕەتــدا لــە چاوگی (بــوون - هەبــوون)ەوە ســەرچاوەیان گرتووە.

| | | |
|---|---|---|
| • پارەم هەبوو. | پارەم هەیە. | پارەم دەبێت. |
| • هەم بوو. | هەمە. | دەمبێت. |
| • نازەنین منداڵی بوو | نازەنین منداڵی دەبێت | منداڵی دەبێت |

لە ڕستەی (پارەم هەبوو.........) (بوو) کاری تەواوی تێپەڕە، بەرکارەکەی وشەی (پارە)یە، جێناوەکەش (م)ە، کە بووە بە بکەری ڕستەکە.

لە ڕستەکانی (هەم بوو)(١) (هە) لەگەڵ کاری ڕابردوو (بوو) و ڕانەبردوو (ە) بۆ دەمی ئێستا دەرکەوتووە، بەڵام لە ڕانەبردوودا بۆ دەمی داهاتوو لە شێوەی (دەمبێت)دا کەوتووەتە بەر چاو.

لە ڕستەی (نازەنین منداڵی بوو) (بوو) کاری تەواوی تێپەڕە، بەرکارەکەی وشەی (منداڵ) ە. بکەرەکەشی (نازەنین)ە.

### دووەم کاری تەواوی تێنەپەڕ

ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی بەشی (ب) دەبینین:
کارەکان وەک کاری تەواوی تێنەپەڕ، لە ڕستەکاندا دەرکەوتوون بەتەنها ئەرکی بکەرەکانیان ئەنجامداوە و واتای ڕستەکانیان تەواوکردووە.

لە ڕستەی (١-٢)دا بەهۆی پێشگری (هەڵ ، ڕا) وە کاری دارێژراوی تەواوی تێنەپەڕیان پێکهێناوە، کە بەتەنها ئەرکی بکەرەکانیان ئەنجامداوە، واتای ڕستەکانیان تەواوکردووە، بەڵام لە ڕستەی (٣ ، ٤)دا، کارەکان هەریەکەیان لەگەڵ وشەی (تەواو، سوڕ)دا کارێکی لێکدراوی تەواوی تێنەپەڕیان پێکهێناوە، ئەرکی بکەرەکانیان گەیاندووەتە ئەنجام و واتای ڕستەکانیان تەواوکردووە.

ئەگەر بە واتای بوون (وجود) هات، ئەو دەمە دەبێتە کاری تەواوی تێنەپەڕ.

من هەبووم. - من هەم. - من دەبم.

## سێیەم کاری ناتەواو

لـە هەندێک باری ڕسـتەدا کارەکانی (بوو- ە - دەبێـت)، ناتوانێت ئەرکی نیهادەکانیان ئەنجامبـدەن، یان واتای ڕسـتەکان تەواوبکەن، بەڵکو بۆ ئەو مەبەسـتە پێویسـتیان بە وشـە یـان بەشـێکی تر دەبێـت، بۆ ئەوەی ئـەو ئەرکە تەواوبکەن، ئـەو دەمە بـەو کارانە دەوترێت کاری (ناتەواو)، ئەو وشـە و بەشـانەش، کە دەبنە پاڵپشـت بۆ ئەو تەواوکردنە پێیان دەوترێت (تەواوکـەر)، کـە بریتیـن لـە (نـاو ، چـاوگ ، جێنـاو ، هاوەڵناو، هاوەڵـکار)، کە بە شـێوەی تەواوکـەری ڕاسـتەوخۆ و تەواوکـەری بەیاریـدە ئەرکـی تەواوکردنـی کارە ناتەواوەکـە ئەنجامـدەدەن. لێـرەدا با بزانین ئەم تەواوکردنە چۆن و بە چ شـێوەیەک تەواودەکرێن، ئەگەر سـەرنج بدەینە ڕسـتەکانی بەشـی (پ) دەبنین:

لـە ڕسـتەی (١)دا ناوی مامۆسـتا*، کـە ناوێکی گشـتییە، تەواوکەری ڕاسـتەوخۆی کاری (ە)ی ناتـەواوە، ئەگـەر ئـەم نـاوە نەبوایە، کاری (ە) لەگـەڵ نیهادەکەیـدا، نەیدەتوانی واتـای ڕسـتەکە تەواوبکات.

لـە ڕسـتەی (٢)دا، بە هەمان شـێوە، چاوگی (خوێندن)، کـە وەک ئەرکی تەواوکەری ڕاسـتەوخۆ کاری (بـوو) ناتەواوی وەرگرتـووە، ئەگەر ئەم چاوگە نەبوایـە، کاری ناتەواوی (بـوو) لەگەڵ نیهادەکەیـدا، نەیدەتوانـی واتای ڕسـتەکە تەواوبکات.

لـە ڕسـتەی (٣)دا، جێنـاوی سـەربەخۆی (ئەو) ئەرکـی تەواوکردنـی کاری (دەبێت) ی ناتـەواوی وەرگرتـووە، ئەگـەر ئـەم جێنـاوە نەبوایـە، کاری (دەبێت) لەگـەڵ نیهادەکەیدا نەیدەتوانـی واتـای ڕسـتەکە تەواوبـکات.

لـە ڕسـتەی (٤)دا، هاوەڵـکاری (بەشـەو) ئەرکـی تەواوکردنـی (بـوو)ی ناتـەواوی وەرگرتـووە، ئەگـەر ئـەم هاوەڵـکارە نەبوایـە کاری ناتـەواوی (بـوو) لەگـەڵ نیهادەکەیـدا نەیدەتوانـی واتـای ڕسـتەکە تەواوبـکات.

لە ڕستەی (٥)دا، هاوەڵناوی چۆنیەتی (فێنک) ئەرکی تەواوکردنی کاری (ە)ی ناتەواوی وەرگرتـووە، ئەگەر ئـەم هاوەڵناوە نەبوایە، کاری (ە) لەگـەڵ نیهادەکەی دا نەیدەتوانی واتای ڕسـتەکە تەواوبکات.

ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی کۆمەڵەکەی تر دەبینین:

لە ڕسـتەی (١)دا، ناوی (سـەهۆڵ) تەواوکـەری بەیاریدەی کاری ناتـەواوی (دەبێتە، ئەگـەر ئـەم نـاوە نەبوایـە، کاری ناتـەواوی دەبێت لەگـەڵ نیهادەکەیـدا، نەیدەتوانـی واتای

* هەموو ناو و گرێیێکی ناوی دەبن بە تەواوکەر بۆ کاری ناتەواو.

ڕستــەکە تەواوبــکات، بوونایەتی و ئـەو گۆڕانکارییە دەربخات، کە بەســەر ناوەکەدا هاتووە.

لە ڕســتەی (٢)دا، چاوگی (تێکۆشــان) کە تەواوکەری بەیاریــدەی کاری ناتەواوی(ە) یــە ئەگــەر ئەم چاوگــە نەبوایــە، کاری ناتــەواوی(ە) لەگـەڵ نیهادەکەیـدا، نەیدەتوانی واتای ڕســتەکەی تــەواو بکات.*

لە ڕســتەی (٣)دا، جێناوی کەســی ســەربەخۆی (مــن) تەواوکــەری بەیاریدەی کاری (بــوو)ی ناتــەواوە، ئەگەر ئــەم جێناوە نەبوایــە، کاری (بوو)ی ناتــەواو لەگــەڵ نیهادەکەیدا، نەیدەتوانــی واتای ڕســتەکە تەواوبــکات و ئەو گۆڕانکارییە پیشــانبدات، کە لــە جێناوی (تۆ) وە چــووە بۆ جێنــاوی (من).

لێــرەدا پێویســتە ئــەوە بزانرێــت، کــە هەرچی( هاوەڵنــاو، هاوەڵــکار)ە، بە شــێوەی تەواوکــەری ڕاســتەوخۆ، کاری ناتــەواو تەواودەکــەن.

## چوارەم کاری یاریدەدەر

هــەر ئــەم کارە لــە چەنــد بارێکــی تــردا وەک کاری یاریــدەدەر، لەگــەڵ کارەکانــی شــێوازی دانانــی دەردەکــەون، هــەروەک لــە ڕســتەکانی بەشــی (ت)دا، لــە شــێوەی (دەبــوو، دەبوایــە، دەبێــت)، کــە هەمیشــە دەکەونــە پێــش کارە ســەرەکییەکانەوە، بــۆ دەرخســتنی هەندێــک لایەنــی ڕێزمانــی بــۆ کارە ســەرەکییەکان.

### نەرێکردنی ئەم کارە:

### أ- دەمی ڕابردوو:

بە دانانی نیشانەی (نە)ی نەرێ لەبەردەم کارەکەدا.

پارەم هەبوو. ← پارەم نەبوو.

ئاهەنگەکە بەشەو بوو. ← ئاهەنگەکە بەشەو نەبوو.

دەبوو. ← نەدەبوو.

### ب- دەمی ئێستا:

بە دانانی نیشانەی (نی) لەبەردەم کارەکەدا.

پارەم هەیە. ← پارەم نییە — من پارە نینە

کاوە مامۆستایە. ← کاوە مامۆستا نییە. — کاوە مامۆستا نینە.

* هەموو جێناوێکی سەربەخۆ(کەسی سەربەخۆ، پرس، خۆیی، نادیار، نیشانە) هەروەها جێناوی هەیی لەگەڵ دیارخەرەکەی دەبن بە تەواوکەری کاری ناتەواو.

## پ- دەمی ڕانەبردوو

بە گۆڕینی نیشانەی (دە) بە نیشانەی (نا)

پارەم دەبێت. ← پارەم نابێت.

ئاوەکە دەبێت بە سەهۆڵ. ← ئاوەکە نابێت بە سەهۆڵ.

هەروەها دەبێت ئاماژە بەوە بکەین کە:

١- کاری ناتەواو لە ڕووی کاریگەرییەوە (تێنەپەڕە).

٢- کاری (بوو- ە – دەبێت) لە هەموو بارێکدا ناکرێت بە بکەرنادیار.

٣- کاری ناتەواو (ە) بۆ دەمی ئێستا لە ڕستەدا دەرناکەوێت، ئەگەر جێناوە کەسییە لکاوەکان دیار و ئاشکرابن ( م – ین ، یت – ن ، (∅) – ن )، بە واتا کارەکە بکەوێتە نێوان (وشەکە)* و جێناوە کەسییە لکاوەکان

| | |
|---|---|
| کوردم | کوردین |
| کوردیت | کوردن |
| کوردە | کوردن |

### دەستور

ئەو کارانەی لە چاوگی (بوون)ەوە وەردەگیرێن، ئەگەر بۆ خاوەنداریتی (تملک) یان مندالبوون بەکارهاتن، دەبنە کاری تەواوی تێپەڕ.

بەشێوەیەکی گشتی، پێشگر، کە دەچێتە سەر ئەو جۆرە کارانە، کارەکە دەکەن بە کاری تەواوی تێنەپەڕی داڕێژراو.

کاری لێکدراو، کە لە چاوگی (بوون)ەوە وەردەگیرێت، کە وشە واتادارەکەی بوو بە واتا بۆ کارەکە، ئەو دەمە کارەکە دەکات بە کارێکی تەواوی لێکدراوی تێنەپەڕ.

بەمانای بوون (وجود) هات تەواوی تێنەپەرە.

ئەگەر کاری (بوو- ە- دەبێت) نەیتوانی بە تەنها واتای ڕستەکە تەواوبکات، پێویستی بە وشە یان بەشێکی تر هەبوو، ئەو دەمە ئەو کارانە دەبنە کاری ناتەواو.

ئەو بابەتە ڕێزمانییانەی کاری ناتەواو تەواودەکەن، وەکو تەواوکەری ڕاستەوخۆ و تەواوکەری بەیاریدە، بریتین لە ( ناو- جێناو- چاوگ).

ئەو کارە یاریدەدەرانەی لە چاوگی (بوون) وەردەگیرێن ئەمانەن:

(دەبوو – دەبوایە – دەبێت) کە لەگەڵ ڕستەی شێوازی دانانیدا بەکاردێت.

(*) مەبەست لە وشە (ناو- چاوگ- هاوەڵکار- هاوەڵناو- جێناوە سەربەخۆکان)ە.

## ئەرکی ( ە ) لە ڕێزمانی کوردیدا

١ دەبێتە کاری ناتەواو لە ڕستەی سادەدا، ئەگەر کاری سەرەکی لە ڕستەدا نەبوو، بۆ نمونە:

بەرزترین لوتکە لە چیاکانی کوردستاندا، ئاراراتە.

٢ دەبێتە جێناوی لکاو بۆ کەسی دووەمی تاک لە کاری داخوازیدا، ئەرکی بکەر دەبینێت، بۆ نمونە:

بخوێنە، تا دەربچیت.

٣ دەبێتە جێناوی کەسی لکاو. بۆ کەسی سێیەمی تاک لەگەڵ کاری ڕانەبردوو لە کرمانجی سەروودا*. بۆ نمونە:

ئەو چیرۆکێ دنڤیسە.

ئەو دکەڤە.

٤ دەبێتە پاشگر لەگەڵ هەندێک قەدی چاوگدا بۆ دروستکردنی هاوەڵناوی کراوی داڕێژراو

کرد ← کردە ، برد ← بردە.

کوشت ← کوشتە.

٥ دەبێتە پاشگر لەگەڵ ناو یان هاوەڵناو یان ڕەگی کار بۆ دروستکردنی وشەی نوێ.

١. هاوەڵناو + پاشگر: چاك ← چاکە ، سەوز ← سەوزە.

٢. ناو + پاشگر: دەست ← دەستە.

٣. ڕەگی کار + پاشگر : پرس ← پرسە

٦ دەبێتە ئامرازی پێناسین، کە کورتکراوەی (ەکە)ی پێناسینە.

ژنە هەژاربوو، بۆیە دەگریا.

٧ دەبێتە ئامرازی لێکدان بۆ دروستکردنی وشەی لێکدراو. بۆ نمونە:

ڕەشەبا - گوڵەگەنم - مانگەشەو - پیرەمێرد - کێوەڕەش

(*) لە هەندێ ناوچەی ئەم شێوەزارەدا وای لێدێت، ئەگینا لە ناوچەکانی تر دەگوترێت: (ئەو دەرسێ دنڤیسیت).

**٨** دەبێتــە ئامــرازی پەیوەندی، دەلکێــت بە کاری ڕابــردوو، ڕانەبردوو، داخــوازی جێگای ئامــرازی (بۆ ، بــە) دەگرێتەوە.

- (ە ← بۆ):

کاوە هاتە لامان. کاوە هات بۆ لامان.

- (ە ← بە):

ئازاد دەبێتە ئەندازیار. ئازاد دەبێت بە ئەندازیار.

- (ە ← بۆ):

بڕۆنە مۆزەخانە. بڕۆن بۆ مۆزەخانە.

**٩** دەبێتە ئامرازی بانگکردن، بە دوای ناودا دێت بۆ مەبەستی بانگکردن:

کوڕە، بخوێنە. کوردە، هەوڵبدە.

**١٠** دەبێتــە ئامــرازی دانەپاڵ و گرێی ناوی دروســتدەکات لــەو کاتەی کە لەنێــوان ناوێکی ناســراو، دیارخــراو بە هاوەڵنــاوی چۆنیەتی دێــت بۆ نمونە:

مەڕە لاوازەکە، هەنارە مزرەکە، سێوە سوورەکان

## ڕاهێنان - ١

**لەم ڕستانەی خوارەوەدا ئەو کارانەی، کە لە چاوگی (بوون)ەوە وەرگیراون دەربهێنە؟ جۆرەکانیان دەستنیشان بکە؟**

١- گەلی کورد سوربوو لەسەر بەدیهێنانی مافەکانی.

٢- دەبێت یەکڕیزی گەل بپارێزین.

٣- کە دایکیان منداڵی بوو، منداڵەکە نەخۆشبوو.

٤- کێشەی ئاوارەکانی کەرکوک کەی پەیدابوو؟

٥- باوکیان لەخەو ڕابوو.

## ڕاهێنان - ٢

**ئەرکی (ە) لەم ڕستانەی خوارەوەدا، دەستنیشان بکە لەگەڵ ڕوونکردنەوەی پێویست؟**

١- کوڕە، بە دانیشتن ماڵت وێرانە.

٢- بخوێنە، چونکە خوێندن سارێژکەری برینەکانتە.

٣- ڕەشەبای سلێمانی بەهێزە.

٤- چیرۆکەکێ بنقیسە.

٥- منداڵە گەمەی دەکرد، دایکەش تەماشایدەکرد.

## ڕاهێنان - ٣

**وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە.**

١- کاری چاوگی بوون بە واتای بوون (وجود) بێت دەبێتە:

ئـ- کاری یاریدەدەر      ب- کاری ناتەواو

پ- کاری تەواوی تێپەڕ      ت- کاری تەواوی تێنەپەڕ

٢- کام لەم ڕستانە کارەکەی ناتەواوە؟

ئـ- ئەندازیارەکە لێهاتووبوو.      ب- دەبوو تاقیکردنەوە کرابا.

پ- منداڵێکی بوو.      ت- منداڵی هەبوو.

٣- لە ڕستەی (ئەوان لە ئاهەنگەکە ئامادەبوون) کاری ڕستەکە.

ئـ- ناتەواوە
ب- تەواوی تێپەرە
پ- تەواوی تێنەپەرە
ت- یاریدەدەرە

٤- لە ڕستەی (من کوردم) وشەی (کورد) ئەرکی چییە؟

ئـ- بکەرە
ب- نیهادە
پ- بەرکارە
ت- تەواوکەری ڕاستەوخۆی کاری ناتەواوە

٥- لە ڕستەی (چیاکانی کوردستان بڵندن) چی دەرنەکەوتووە؟

ئـ- ئامرازی دانەپاڵ
ب- کاری ناتەواو
پ- نیهاد
ت- بکەر

٦- (گوڵەهێـرۆ جوانـە). ئەرکی بزوێنی (ە)ی نێوان هەردوو وشـەی (گـوڵ .....هێرۆ) چیە؟

ئـ- ئامرازی دانەپاڵە
ب- ئامرازی لێکدانە
پ- ئامرازی بانگکردنە
ت- ئامرازی پێناسینە

٧- (هەنارە مزرەکە خۆش بوو). ئەرکی بزوێنی (ە)ی نێوان هەردوو وشەی (هەنار ... مزرەکە) چییە؟

ئـ- ئامرازی دانەپاڵە
ب- ئامرازی لێکدانە
پ- ئامرازی بانگکردنە
ت- ئامرازی پێناسینە

٨- (کوڕە هەژارە). ئەرکی بزوێنی(ە)ی دوای (کوڕ) بریتییە لە:

ئـ- ئامرازی دانەپاڵە
ب- ئامرازی لێکدانە
پ- ئامرازی بانگکردنە
ت- ئامرازی پێناسینە

٩- (چاکە بە خەڵکی بکە). ئەرکی بزوێنی(ە)ی دوای (چاک) بریتییە لە:

ئـ- ئامرازی لێکدانە
ب- کاری ناتەواوە
پ- پاشگرە
ت- ئامرازی پێناسینە

١٠- (منداڵەکە ناچێتە قوتابخانە). ئەرکی بزوێنی(ە)ی نێوان (ناچێت) و (قوتابخانە)

ئـ- ئامرازی دانەپاڵە
ب- ئامرازی پەیوەندیە
پ- ئامرازی بانگکردنە
ت- ئامرازی پێناسینە

# ئەرکی جێناوە کەسییە لکاوەکان

## یەکەم: وەك بکەر

- أ -

١- دوێنێ، گۆڤارێکم کڕی.

دوێنێ کڕیم.

٢- گۆڤارەکەم هەڵگرتبوو.

هەڵم گرتبوو.

٣- قوتابییەکەم بانگدەکرد.

بانگمدەکرد.

٤- تاوانبارەکەم دەستنیشانکردووە.

دەستنیشانمکردووە.

- ب -

١- پێرێ چووم بۆ کەرکوك.

٢- لە تاقیکردنەوەکەدا بەیەکەم دەرچووم.

٣- خێرا هاتمەوە.

٤-سەرکەوتینەوە سەر شاخەکە.

- پ -

١- وانەکە دەخوێنێت.

٢- گوندەکان ئاوەداندەکەنەوە.

٣- لەپێناو نیشتیماندا تێدەکۆشین.

- ت -

١- نەمامەکە بڕوێنە.

٢- ناوی خوێندکارەکان تۆمار بکەن.

مەبەست لە ئەرکی جیناوە کەسییە لکاوەکان لە دەوری بکەردا، ئەوەیە، کە هەروەک چۆن ناو، یان جێناوە سەربەخۆکان بە هەموو جۆرەکانییانەوە، لە ڕستەدا دەبن بە بکەر، هەروەک لە قۆناغەکانی ڕابردووی خوێندندا ڕوونکراوەتەوە و دەرخراوە، هەر بەم جۆرەش جێناوە لکاوەکان دەبنە بکەر لە ڕستەدا، جا ئەگەر بە وردی سەیری ڕستەکانی پێشوو بکەین دەبینین:

## یەکەم

لە هەموو ڕستەکانی بەشی (ئـ)دا کارەکان هەموویان کاری ڕابردووی تێپەڕن، هەیانە (سادە یان ناسادەن) و لێرەدا شوێنی جیناوە کەسییە لکاوەکان، ئەوانەی دەبنە بکەر نیشاندەدەین.

**أ** ئەگەر کاری ڕستەکە ڕابردووی تێپەڕی سادە بێت و بەرکار لە ناو ڕستەکەدا باسکرابێت، ئەوا هەمیشە جێناوی لکاوی بکەر دەچێتە دوای بەرکارەکە، وەک لە ڕستەی یەکەمی بەشی (ئ)دا دەرکەوتووە، لەم ڕستەیەدا وشەی (گۆڤارێک) بەرکارە و جێناوی کەسی لکاوی (م) بکەری کارەکەیە و کارەکەش ڕابردووی تێپەڕی سادەیە و ئەگەر بەرکار، باسنەکرێت جێناوی لکاو دەچێتە کۆتایی کارەکە وەک کڕیم.

**ب** ئەگەر کاری ڕستەکە ڕابردووی تێپەڕی (ناسادە) بوو، بەرکار باسکرابوو، ئەوا دیسان جێناوی لکاوی بکەر دەچێتە دوای بەرکارەکەوە، وەک لە ڕستەکانی (٢-٣)ی بەشی (ئـ)دا دەرکەوتووە، بەڵام ئەگەر بەرکارەکە باس نەکرابوو، ئەوا جێناوی کەسی لکاوی بکەر دەچێتە دوای بەشی یەکەمی کارەکە وەک: (هەڵمگرتبوو، بانگمدەکرد).

**پ** ئەگەر کارە لێکدراوەکە لە سێ وشەی واتادار یان زیاتر پێکهاتبوو، واتە بەشی یەکەمی کارە لێکدراوەکە وشەیەکی لێکدراو بوو، ئەوا جێناوی کەسی لکاوی بکەر دەکەوێتە دوای وشە لێکدراوەکە کاتێک بەرکار لادەبرێت ، وەک لە ڕستەی (٤)ی بەشی (ئ)دا دەرکەوتووە، ئەگەر سەیری جێناوە لکاوەکان بکەین لە ڕستەکانی بەشی (ئـ)دا، دەبینین لە هەموویاندا جێناوی کەسی لکاو (م)ە، جا دەتوانین بەپێی مەبەست لەبری ئەم جێناوە، جێناوەکانی (م- مان، ت - تان، ی- یان) بەڕیز بەکاربهێنین.

## دووەم

ئەگەر کاری ڕستەکە، کارێکی ڕابردووی تێنەپەڕ بوو، ئەوا جێناوە کەسییە لکاوەکانی (م ، ین ، یت ، ن، Ø ، ن) دەبنە بکەر و دەچنە کۆتایی کاری ڕستەکە، جا کارەکە (سادە، ناسادە) بێت، خۆ ئەگەر کاری ڕستەکە (ناسادە) بوو، بە پاشگری (ەوە) کۆتایی هاتبوو، ئەوا جێناوی کەسی لکاوی بکەر دەکەوێتە پێش ئەم پاشگرە، وەک لە ڕستەکانی (٣-٤)ی بەشی (ب) پیشاندراوە، هەروەها پێویستە ئاماژە بەوە بکەین*.

ئەگەر کاری ڕستەکە ڕانەبردووی (تێپەڕ و تێنەپەڕ) بێت، ئەوا جێناوە کەسییە لکاوەکانی کۆمەڵەی (م، ین- یت، ن – (ات / ێت) ،ن ) دەبنە بکەر و دەچنە دوای ڕەگی کارەکە.

## سێیەم

ئەگەر کاری ڕستەکە (سادە و ناسادە) بێت. جێناوی کەسی لکاوی بکەر بۆ کەسی سێیەمی تاک بەپێی پیتی کۆتایی ڕەگی کارەکە دەگۆڕێت، ئەگەر ڕەگی کارەکە بە پیتی بزوێنی (ە ، ۆ) کۆتایی هاتبوو، جێناوی کەسی لکاوی (ات) بەکاردەهێنرێت، وەک (دەشوات – دەڕواتەوە- دادەخات- چاپدەکات ......)، بەڵام ئەگەر ڕەگی کارەکە بە پیتی (بزوێنی (ە، ۆ) کۆتایی نەهاتبوو ئەوا جێناوی کەسی لکاوی (ێت) بەکاردەهێنرێت، وەک (دەنووسێت – هەڵدەفڕێت – دەفرۆشێت... هتد).

## چوارەم

ئەگەر کاری ڕستەی داخوازی (تێپەڕ یان تێنەپەڕ)ی (سادە و ناسادە) بێت ئەوا جێناوە کەسییە لکاوەکانی (ە- ن) دەبن بە بکەر و دەچنە دوای ڕەگی کارەکە.

---

(*) ئەگەر کاری ڕستەکە ڕابردووی تێنەپەڕ بێت، ئەوا جێناوی کەسی لکاوی بکەر بۆ کەسی سێیەمی تاک دەرناکەوێت. وەک: (لە باخچەکە دانیشت)،

## دەستور

**١-** ئەگــەر کاری ڕســتەکە ڕابــردووی تێپــەڕ بێــت جێنــاوە کەســییە لکاوەکانــی (م ـ مان، ت ـ تان، ی ـ یان) دەبنە بکەری ڕســتەکە و شــوێنیان لەناو ڕستەکە دەگۆڕێت:

ئـ ــ ئەگەر کارەکە (ســادە و ناســادە) بێــت و بەرکار باســکرابێت، ئــەوا جێناوی کەســی لــکاوی بکــەر دەچێتــە دوای بەرکارەکە.

ب ـ بەڵام ئەگەر بەرکارەکە باس نەکرابێت، کارەکەش سادە بێت، ئەوا جێناوە کەسییەلکاوەکان دەچنە سەر کارە سادەکە، ئەگەر لە دەمی ڕابردووی نزیک و دووری ڕاگەیاندن بوو جێناوەکان دەچنە کۆتایی کارەکە. بەڵام ئەگەر لە دەمی ڕابردووی بەردەوامی ڕاگەیاندن بوو جێناوەکان دەچنە دوای نیشانەی (دە)، خۆ ئەگەر لە دەمی ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندن بوو جێناوەکان دەچنە نێوان نیشانەی (وە) / (ووە). لە نەرێ دەچنە دوای ئامرازی (نە).

خــۆ ئەگــەر کارەکە ( ناســادە) بــوو، ئــەوا دەچنە دوای بەشــی یەکەمــی کارەکە.

**٢-**

ئـ ــ بــەڵام ئەگــەر کاری ڕســتەکە (ڕابــردووی تێنەپەڕ) بێــت، جێناوە کەســییە لکاوەکانــی کۆمەڵــەی (م ـ ین، یت ـ ن، (Ø) ـ ن) ئەرکی بکەر دەبینن و دەکەونە کۆتایــی کارەکــە، جگە لە ڕابــردووی تــەواوی ڕاگەیاندن.

ب ــ ئەگــەر کاری ڕســتەکە (ڕانەبــردووی تێنەپەڕ و تێپەڕ) بێت، جێناوە کەســییە لکاوەکانــی کۆمەڵــەی (م ــ ین، یت ــ ن) (ێت ـ ات) ــ ن) دەکەونە دوای ڕەگی کارەکەوە.

**٣-** ئەگــەر کارەکــە داخوازی بێت ئەوا جێناوی کەســی لکاوی (ە ــ ن) دەبن بە بکەر و دەکەونە دوای ڕەگی کارەکە.

## ڕاهێنان - ١

**كەی ئەم جێناوە كەسییە لكاوانەی خوارەوە لەناو ڕستەكەدا وەك بكەر دەوری خۆیان دەبینن، بۆ هەریەكەیان نمونەیەك بهێنەوە.**

( ات، مان، ین، ە )

## ڕاهێنان - ٢

**لە ڕستەی (وتارەكەت بڵاوكردووەتەوە).**

١- كاری ڕستەكە لە چ ڕێژەیەكدایە؟ چۆن دروستكراوە؟

٢- (ت) لە كۆتایی وتارەكەت چییە و ئەركی چییە؟ بۆچی خراوەتە ئەوێ؟

٣- وشەی وتارەكە شیبكەوە.

٤- ئەگەر وشەی وتارەكە لاببرێت (ت) دەچێتە كوێ؟ بۆچی؟

## ڕاهێنان - ٣

**وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە.**

١- (باخچەكەیان بۆ ڕازاندەوە). جێناوی لكاوی (یان) ئەركی بریتییە لە:

ئ- بكەر ب- بەركار پ- تەواوكەری بەیاریدە ت- دیارخەری ناو

٢- (تاوانبارەكەمان دەستنیشانكردووە). ئەگەر (بەركار) لابدەین (مان) دەچێتە:

ئ- دوای (دەست) ب- دوای بەشی یەكەمی كارەكە

پ- نێوان نیشانەی كار ت- كۆتایی كار

٣- لە ڕستەی (ناوی خوێندكاران تۆماربكە) چی دەرنەكەوتووە؟

ئ- بكەر ب- بەركار

پ- تەواوكەری بەیاریدە ت- دیارخەری ناو

٤- (کلتوری کورد دەپارێزێت)، بگۆڕین بۆ ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندن دەبێتە:

ئـ- کلتوری کوردیان پاراست. ب- کلتوری کوردمان پاراست.

پ- کلتوری کوردتان پاراست. ت- کلتوری کوردی پاراست.

٥- لە کام لەم کارانە جێناوی لکاوی بکەر دەچێتە کۆتایی کارەکە:

ئـ- ئاوەدانکردبوو ب- یارمەتیدابوو

پ- فێردەبوو ت- دادەمەزراند

## ڕاهێنان - ٤

**لە ڕستەی (لە وانەکان باش تێگەیشتووە).**

١- بکەری ڕستەکە دەستنیشانبکە؟ بۆچی؟

٢- کاری ڕستەکە بگۆڕە بۆ ڕێژەی ڕانەبردووی ڕاگەیاندن، چ گۆڕانێک ڕوودەدات بینووسەوە.

٣- وشەی (وانەکان) شیبکەوە.

٤- وشەی (باش) چییە؟ ئەرکی چییە؟

# ئەركی جێناوە كەسییە لكاوەكان

## دووەم- وەك بەركار

| ئـ (م ـمان ، ت ـتان ، ی ـیان) | |
|---|---|
| ١- بمبەخشن.<br>بیبەخشن. | بمانبەخشن.<br>بیانبەخشن. |
| ٢- وەرمگرە.<br>وەریبگرە. | وەرمانبگرە.<br>وەریانبگرە. |
| ٣- بانگمبكەن.<br>بانگیبكەن. | بانگمانبكەن.<br>بانگیانبكەن. |

| ب : | |
|---|---|
| ١- دەمناسێت. | دەماناسێت. |
| ٢- هەڵمدەبژێرن. | هەڵتاندەبژێرن. |
| ٣- هانیدەدات. | هانیاندەدات. |

| پ: | |
|---|---|
| (١) | (٢) |
| گرتمی- گرتینی<br>گرتیتی- گرتنی<br>گرتی- گرتنی | گرتمی- گرتمانی<br>گرتتی- گرتتانی<br>گرتی- گرتیانی |
| هەڵیبژاردم- هەڵیبژاردین<br>هەڵیبژاردیت- هەڵیبژاردن<br>هەڵیبژارد- هەڵیبژاردن | هەڵمیبژارد- هەڵمانیبژارد<br>هەڵتیبژارد- هەڵتانیبژارد<br>هەڵیبژارد- هەڵیانیبژارد |
| پەروەردەیكردم- پەروەردەیكردین<br>پەروەردەیكردیت- پەروەردەیكردن<br>پەروەردەیكرد- پەروەردەیكردن | ڕزگارمیكرد- ڕزگارمانیكرد<br>ڕزگارتی كرد- ڕزگارتانیكرد<br>ڕزگاریكرد- ڕزگاریانیكرد |

لەمەو پێش ئەوە فێربووین، کە بەرکار هەمیشە لەگەڵ کاری تێپەڕ دێتەکایەوە، ئینجا لێرەدا دەمانەوێت بزانین، کە جێناوە کەسییە لکاوەکان چۆن دەبنە بەرکار لە ڕستەدا؟ لەوەڵامدا دەڵێین، جێناوە کەسییە لکاوەکان دەبنە بەرکار لە ڕستەدا بەم شێوەیەی خوارەوە:

**أ** ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (ئ) بکەین، دەبینین کارەکانی (ببەخشن، وەربگرە، بانگبکەن) هەموویان کاری داخوازی تێپەڕن، لەگەڵ ئەم کارانەدا کۆمەڵە جێناوی کەسیی لکاوی (م ـ مان ، ی ـ یان) دەبنە بەرکار، جا ئەگەر کاری داخوازی تێپەڕ (سادە) بوو، ئەوا جێناوی کەسیی لکاو لە دەوری بەرکاردا دەچێتە دوای نیشانەی (بـ) وەکو لە ڕستەی (بمبەخشن ـ بمانبەخشن ......) دیارە، بەڵام ئەگەر کاری داخوازی تێپەڕ (ناسادە) بوو، جێناوی کەسیی لکاو لە دەوری بەرکاردا دەچێتە دوای بەشی یەکەمی کارەکەوە، وەکو لە ڕستەکانی (وەرمبگرە ـ وەرمانبگرە.....) یان (بانگمبکەن ـ بانگمانبکەن......) پیشاندراوە.

**ب** ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (ب) بکەین، دەبینین کارەکانی (دەناسێت ، هەڵدەبژێرن، هاندەدات) هەموویان کاری ڕانەبردووی تێپەڕن، لەگەڵ ئەم کارانەدا کۆمەڵەی جێناوی کەسیی لکاو (م ـ مان ، ت ـ تان ، ی ـ یان) دەبنە بەرکار، جا ئەگەر کاری ڕانەبردووی تێپەڕی سادە بێت، جێناوی لکاوی بەرکار دەچێتە دوای نیشانەی (دە) وەکو لە ڕستەکانی (دەمناسێت ـ دەماننااسێت .......) پیشاندراوە، بەڵام ئەگەر کاری ڕانەبردووی تێپەڕ (ناسادە) بێت ئەوا جێناوی کەسیی لکاوی بەرکار دەچێتە دوای بەشی یەکەمی کارەوە، وەکو لە ڕستەکانی (هەڵتدەبژێرن ــ هەڵتاندەبژێرن.....)، یان (هانیدەدات ـ هانیاندەدات) دا پیشاندراوە.

**پ** ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (پ) بکەین، دەبینین کارەکانی (گرت ـ هەڵبژارد ـ پەروەردەکرد ـ ڕزگارکرد) ڕابردووی تێپەڕن، لەگەڵ ئەم کارانەدا هەردوو کۆمەڵە جێناوە کەسیە لکاوەکان دەبنە بەرکار لە دوو شێوەدا:

## یەکەم

کۆمەڵە جێناوی کەسیی لکاو (م ـ ین ، یت ـ ن ، Ø ـ ن) دەبنە بەرکار، جا ئەگەر کارەکە (سادە) بێت، ئەوا جێناوی لکاوی بەرکار دوای جێناوی لکاوی بکەر دەکەون، ئەگەر کەسی یەکەم یا دووەم (تاک و کۆ) بکەری ڕستەکە بن وەک: (گرتمن ـ ناردمیت ـ گرتتن ــ گرتتانن).

خۆ ئەگەر جێناوی لکاوی بکەر کەسی سێیەمی تاک یان کۆ بێت، ئەوا جێناوی کەسیی لکاوی بەرکار پێش جێناوی کەسیی لکاوی بکەر دەکەوێت، وەک (گرتمی ــ گرتنی ـ ناردمیان).

خۆ ئەگەر کارەکە (ناسادە) بێت، ئەوا جێناوی کەسیی لکاوی بەرکار دەچنە کۆتایی کارەوە، وەک لە ڕستەکانی (هەڵیبژاردم ــ هەڵیبژاردین....) یان (پەروەردەیکردم ــ پەروەردەیکردین...) پیشاندراون.

## دووەم

کۆمەڵە جێناوی کەسیی لکاو (م ـ مان، ت ـ تان ، ی ـ یان) دەبنە بەرکار، ئەگەر کاری ڕستەکە ڕابردووی تێپەڕی (سادە) بێت، ئەوا کۆمەڵە جێناوە کەسییەکە لە دەوری بەرکاردا دەچنە نێوان کارەکە و جێناوی لکاوی بکەر، وەک لە ڕستەکانی (گرتمی ـ گرتمانی ...) پیشاندراوە، بەڵام ئەگەر کاری ڕستەکە ڕابردووی تێپەڕی (ناسادە) بێت، ئەوا جێناوی لکاوی بەرکار دەچنە دوای بەشی یەکەمی کارەکە وەک لە ڕستەکانی (هەڵمیبژارد ــ هەڵمانیبژارد) یان (ڕزگارمیکرد ـ ڕزگارمانیکرد) پیشاندراون.

لێرەدا دەردەکەوێت، ئەگەر کارەکە ڕابردووی تێپەڕ (سادە، ناسادە) بێت، ئەوا جێناوی لکاو بۆ کەسی سێیەمی تاک لە دەوری بەرکاردا دەرناکەوێت، هەرچەند لە کۆمەڵەی جێناوی (م ـ مان....) جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاک لە دەوری بەرکاردا هەیە، بەڵام بۆ ئاسانکردنی دەربڕین ئەمیش دەرناکەوێت.

## دەستور

١- لەگەڵ کاری داخوازیی تێپەڕی (سادە ، نادادە) کۆمەڵە جێناوی لکاوی (م ـ مان ، ی ـ یان) دەبنە بەرکار، جا ئەگەر کارەکە سادە بێت ئەوا دەچنە سەر نیشانەی (بـ)، خۆ ئەگەر کارەکە (ناسادە) بێت، ئەوا دەچنە دوای بەشی یەکەمی کارەکە.

٢- لەگەڵ کاری ڕانەبردووی تێپەڕی (سادە ، ناسادە) کۆمەڵە جێناوی لکاوی (م ـ مان ، ت ـ تان ، ی ـ یان) دەبنە بەرکار، ئەگەر کارەکە سادە بێت جێناوی لکاوی بەرکار دەچێتە دوای نیشانەی (دە)، ئەگەر کارەکە ناسادە بێت ئەوا جێناوی لکاوی بەرکار دەچێتە دوای بەشی یەکەمی کارەکە.

٣- لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕدا جێناوە کەسییە لکاوەکان دەبنە بەرکار لە دوو شێوەدا:

ئ- دەگونجێت جێناوە کەسییە لکاوەکانی (م ـ مان ، ت ـ تان ، ی ـ یان) ببنە بەرکار، ئەگەر کارەکە سادە بێت جێناوەکان دەچنە نێوان کار و جێناوی لکاوی بکەر، بەڵام ئەگەر کارەکە ناسادە بێت، جێناوەکان دەچنە دوای بەشی یەکەمی کار واتە (سەر بەشی یەکەمی کار)ەکە.

ب- دەگونجێت جێناوە کەسییە لکاوەکان (م ـ ین ، ی ـ ن ، Ø ـ ن) ببنە بەرکار، ئەگەر کارەکە سادە بێت جێناوەکان دەچنە دوای جێناوی لکاوی بکەر ئەگەر بکەری ڕستە کەسی یەکەم یا دووەمی تاک و کۆ بێت، خۆ ئەگەر بکەری ڕستەکە کەسی سێیەمی تاک یان کۆ بێت، ئەوا جێناوی لکاوی بەرکار پێش جێناوی لکاوی بکەر دەکەوێت، بەڵام ئەگەر کارەکە داڕێژراو یان لێکدراو بێت، جێناوی لکاوی بەرکار دەچنە کۆتایی کارەکەوە.

### تێبینی - ا -

جێناوی کەسیی لکاو بۆ کەسی سێیەمی تاک لە دەوری بەرکاردا لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕ دەرناکەوێت.

### تێبینی - ٢ -

لە کرمانجیی سەروودا کۆمەڵە جێناوی (م – ین ، ی – ن ، (ø) – ن ) دەبنە بەرکار یان بۆ بەرکار دەگەڕێنەوە لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕ، وەک:

| | |
|---|---|
| ئازادی ئەز دیتم*. | ئازادی ئەم دیتین. |
| ئازادی تو دی. | ئازادی هوین دیتن. |
| ئازادی ئەو دیت. | ئازادی ئەو دیتن. |

(*) واتە (ئازاد منی دیت).

## ڕاهێنان - ١

جێناوی کەسیی لکاوی (تان ، ین) لە دوو ڕستەدا بەکاربهێنە، لە ڕستەی یەکەمدا (تان) بکەر بێت، (ین) بەرکار بێت، لە ڕستەی دووەمدا (ین) بکەر بێت و (تان) بەرکاربێت.

## ڕاهێنان - ٢

ئەرکی جێناوە لکاوەکانی ناو ئەم رستانەی خوارەوە دیاربکە:

١- بەجوانی سەیری کردین.

٢- بەوردی خوێندمنەوە.

٣- ناردمیان بۆ ئاهەنگەکە.

٤- دەمانیان هێنا بۆ ئێرە.

## ڕاهێنان - ٣

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١- جێناوی (ن) دەبێتە بەرکار لەگەڵ کاری:

ئـ- ڕابردووی تێپەڕ ب- ڕانەبردووی تێپەڕ

پ- داخوازی تێپەڕ ت- هەموویان

٢- (بانگمانکردیت.) ئەگەر کاری ڕستەکە بگۆڕین بە ڕانەبردووی ڕاگەیاندن ئەوا دەبێتە:

ئـ- بانگماندەکەیت ب- بانگماندەکردیت

پ- بانگتدەکەین ت- بانگتناکەین

٣- (وەرتاندەگرتین) دەتوانین (ین) بگۆڕین بە (مان) چونکە کارەکە:

ئـ- ڕابردووی تێپەڕ ب- ڕانەبردووی تێپەڕ

پ- داخوازی تێنەپەڕ ت- ڕابردووی تێنەپەڕ

٤- (هەڵتبژارد) ئەگەر کاری ڕستەکە بکەینە داخوازی ئەوا دەبێتە:

ئـ- هەڵتبژێرم　　ب- هەڵیانبژێرە

پ- هەڵیبژێرە　　ت- هەڵتبژێرن

٥- (بانگیکردم بۆ ئاهەنگەکە) ئەرکی جێناوی لکاوی (م) چییە؟

ئـ- بکەرە　　ب- بەرکارە　　پ- تەواوکەری بەیاریدەیە　　ت- دیارخەرە

## ڕاهێنان - ٤

**لە ڕستەی (پار هەڵی بژاردین ).**

١- (ین) چییە و ئەرکی چییە؟ بۆچی خراوەتە ئەو شوێنە؟

٢- ئەگەر (ین) بگۆڕین بۆ (مان) دەکەوێتە کوێ؟ بۆچی؟

٣- ڕستەکە بگۆڕە بۆ کاتی ڕانەبردوو، هەردوو جێناوە لکاوەکانیش شیبکەوە.

## ئەرکی جێناوە کەسییە لکاوەکان

### سێیەم: وەك تەواوکەری بەیاریدە

/١

أ- نامەکەم بۆ هات (دێت). (م – مان ، ت – تان ، ی – یان)
بۆم هات.
پارەکەت لێ کەوت (دەکەوێت).
لێت دەکەوێت.
هەواڵەکەیان پێ گەیشت (دەگات).
پێیان گەیشت.

ب- کارەکەم بۆ تەواوکرا (دەکرێت).
بۆم تەواوکرا.
دەفتەرەکەت لێ ستێنرا (دەستێنرێت).
لێت ستێنرا.

پ- گوندەکانیان بۆ ئاوەدانەکەنەوە.
بۆیان ئاوەدانەکەنەوە.
کارەکەت پێ دەسپێرێت.
پێت دەسپێرێت.
وانەکەمان تێ دەگەیەنێت.
تێمان دەگەیەنێت.

/٢

أ- دارشتنەکەم بۆ بخوێنەوە.(م – مان ، (-،-) ، ی – یان)
بۆم بخوێنەوە.
هەواڵەکەیان پێ بڵێ.
پێیان بڵێ.

ب- پێیان بگەن.
تێیان بگەن.

/٣

ئـ- پرسیارەکانی بۆم چاپکرد.(م – مان ، ت – تان ، ی – یان)

بۆمی چاپکرد.

ب- پرسیارەکانی بۆ چاپکردم. (م – ین ، یت – ن ، (ø) – ن)

بۆی چاپکردم

پێشتر ئەوەمان زانیوە، کە تەواوکەری بەیاریدە ئەو ناوەیە، یان جێناوەیە، کە لە ڕستەدا واتای کار تەواودەکات بەیارمەتی ئامرازی پەیوەندی، لەگەڵ کاری تێنەپەڕ و تێپەڕدا دێت.

لێرە دەمانەوێت بزانین، کە جێناوی کەسیی لکاو چۆن دەبێتە تەواوکەری بەیاریدە؟

لە وەڵامدا دەڵێین جێناوی کەسیی لکاو دەتوانێت ببێت بە تەواوکەری بەیاریدە و بەپێی جۆر و کاتی کاری ڕستەکە لە چەند شێوەیەکی جیاوازدا دەردەکەون:

## یەکەم

ئەگەر کاری ڕستەکە، کارێکی تێنەپەڕی (ڕابردوو ، یان ڕانەبردوو)ی سادە، داڕێژراو یان لێکدراوبێت. بکەری کارەکە لەناو ڕستەکەدا باسکرابێت، ئەوا کۆمەڵە جێناوی کەسیی لکاو لە کۆمەڵەی ( م – مان ، ت – تان ، ی – یان) لە دەوری تەواوکەری بەیاریدەدا دەچنە دوای ئەو ناوەی کە بکەری ڕستەکەیە، وەک لە ڕستەکانی ژمارە (١) لقی (ئـ) پیشاندراون، وەک دەبینین لە ڕستەی (نامەکەم بۆ هات)دا وشەی (نامەکە) بکەری ڕستەکەیە، (بۆ) ئامرازی پەیوەندییە و جێناوی کەسیی لکاوی (م) لە دوای وشەی (نامەکە)وە هاتووە و تەواوکەری بەیاریدەی کارەکەیە و دەتوانین لەبری جیناوی کەسیی لکاوی (م) هەموو جێناوە کەسییە لکاوەکانی (مان، ت – تان، ی – یان) بەکاربهێنن، بەڵام ئەگەر وشەی (نامەکە) لاببەین ئەوا جێناوی کەسیی لکاوی تەواوکەری بەیاریدە دەچێتە سەر ئامرازە پەیوەندییەکە. بەڵام ئەگەر سەیری ڕستەکانی لقی (ب) بکەین دەبینین کاری (تەواوکرا ، ستێنرا) ڕابردووی بکەرنادیارن و کاری (تەواودەکرێت ، دەستێنرێت)

ڕانەبــردووی بکەرنادیــارن و لەگەڵ ئەم کارانەدا جێناوە کەســییە لکاوەکانی کۆمەڵەی ( م – مــان ، ت – تــان ، ی – یان ) دەبنــە تەواوکەری بەیارێدە و لــەدوای (جێگری بکەر) هکانەوە هاتــوون، لەگــەڵ بوونی ئامــرازی پەیوەندی (بۆ – لێ) لە ڕســتەکاندا، بــەڵام ئەگەر جێگری بکــەرەکان لــە ڕســتەکاندا لاببرێــت، ئــەوا جێنــاوە کەســییە لکاوەکانــی دەوری تەواوکەری بەیارێــدە دەچنە دوای ئامرازە پەیوەندییەکەوە، ئەگەر کاری ڕســتەکە، کارێکی (ڕانەبردووی تێپــەڕ)ی ســادە یان ناســادە بێت و بەرکار لەڕســتەکەدا باســکرابێت، ئەوا جێناوە کەســییە لکاوەکانــی کۆمەڵــەی (م – مــان ،ت – تان، ی – یــان) دەبنە تەواوکــەری بەیارێدە و دەچنە دوای بەرکارەکــە، بــەڵام ئەگــەر بــەرکار لابرا ئــەوا جێناوە کەســییە لکاوەکان دەچنە ســەر ئامــرازە پەیوەندییەکــە* هەروەک لە ڕســتەکانی لقی (پ) پیشــاندراون.

## دووەم

ئەگــەر کاری ڕســتەکە (داخوازیــی تێپــەڕ) بێــت و بەرکار لە ڕســتەکەدا باســکرابێت ئەوا جێنــاوە کەســییە لــکاوەکان ( م – مــان، ی – یــان) دەبنــە تەواوکــەری بەیارێــدە و لەدوای بەرکارەکــەوە دێــن. بەڵام ئەگــەر بەرکار لابرا، ئەوا جێناوە کەســییە لــکاوەکان دەچنە دوای ئامــرازە پەیوەندییەکــەوە وەک لــە ڕســتەکانی ژمارە (٢) لقی (ئ) پیشــاندراون.

خــۆ ئەگــەر کاری ڕســتەکە (داخــوازی تێنەپــەڕ) بێت، ئــەوا جێناوی لــکاوی تەواوکەری بەیارێدە هەمیشە لە دوای ئامرازە پەیوەندییەکە دێت، وەک لە ڕستەکانی لقی (ب) پیشاندراوە.

## سێیەم

ئەگەر کاری ڕســتەکە (ڕابردووی تێپەڕ)ی ســادە یان ناســادە بێت، ئەوا ئەو جێناوە کەسییە لکاوانــەی کە دەبنە تەواوکەری بەیارێدە، لە دوو شــێوەی جیاوازدا دەردەکەون:

أ کۆمەڵــە جێنــاوی کەســیی لــکاوی کۆمەڵــەی (م ـــ مــان ، ت ـ تــان ، ی ـ یــان) دەبنە تەواوکــەری بەیارێدە و یەکســەر لەدوای ئامرازی پەیوەندییەوە دێــن، بەڵام ئەگەر بەرکاری ڕســتەکە لابــرا، ئــەوا جێنــاوی کەســیی لــکاوی بکــەر دوای جێنــاوی لــکاوی تەواوکــەری بەیارێــدەوە دێــت هــەروەک لە ڕســتەکانی ژمــارە (٣) لقی (ئ) پیشــاندراون.

---

(*) دەکرێــت ســێ جێناوی لکاو لە ڕســتەیەکدا بە ئەرکی جیاواز بەکاربێــت، هەندێ جار ئامراز و جێناوی لــکاوی تەواوکــەری بەیارێــدە دەکەونــە دوای کارەکــەوە بە تایبەتــی لە کاتــی ئاخاوتنــدا: **دەیڵێرێت بۆم.**

# چیرۆکی کوردی لە شەڕی دووەمی جیهان

چیرۆکی هونەری، وەک بابەتێکی ئەدەبی تازەی بێگانە هاتە ناو ئەدەبی کوردییەوە، لە بنەڕەتدا هونەرێکی ئەوروپییە پێویستی ژیان وایکردووە، وەک ڕوخسارێکی هونەری لەناو هەموو نەتەوەکانی جیهاندا بڵاوبێتەوە، لە کۆمەڵگەی کوردیش باروودۆخی بۆ هەڵکەوت، ئینجا سەری هەڵدا و پێگەیشت، ئاشکراشە هەموو داهێنانێکی نوێ بە سادەیی دەستپێدەکات، ئینجا گەشەدەکات و پێشدەکەوێت، دەبێت ئەو ڕاستییەش بزانین، کە بێ ئەو سەرەتایە ئەوەی ئێستا هەیە نەدەبوو دوای ئەوەی لە قۆناغەکانی پێشووی خوێندن باسی سەرەتا و سەرهەڵدان و دەرکەوتنی چیرۆکی هونەریی کوردی کرا، ئەوا لە شەڕی دووەمی جیهانەوە چیرۆکی هونەریی کوردی بەپێی چەند قۆناغێکی مێژوویی بەم شێوەیەی خوارەوە دابەشدەکەین.

١- چیرۆکی هونەریی کوردی لەساڵی ١٩٣٩ تا ساڵی ١٩٥٨

٢- چیرۆکی هونەریی کوردی لەساڵی ١٩٥٨ تا ساڵی ١٩٧٠

٣- چیرۆکی هونەریی کوردی لەساڵی ١٩٧٠ تا ساڵی ١٩٩١

## قۆناغی یەکەم: چیرۆکی هونەری کوردی لەساڵی ( ١٩٣٩ – ١٩٥٨ )ز

دەتوانین ئەم قۆناغە ناوبنێین بە قۆناغی گەشەسەندنی چیرۆکی هونەری کوردی، چونکە لەم قۆناغەدا هونەری نووسینی چیرۆکی کورت گەشەیکرد، دەرچوونی چەند گۆڤار و ڕۆژنامەیەکی وەک (گەلاوێژ، دەنگی گێتی تازە لە بەغدا ، هاوار ، ڕۆژا نوو لە شام، ڕۆژنامەی ژین و ژیان لە سلێمانی) ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو لە گەشەسەندنی ئەم تەرزە چیرۆکە.

## چیرۆکی کوردی لە گۆڤاری گەلاوێژ (١٩٣٩-١٩٤٩)ز

یەکێک لەو هونەرە ئەدەبییانەی گۆڤاری گەلاوێژ لە (١٩٣٩- تا ١٩٤٩)ز ڕۆڵێکی ئاشکرا و دیاری لە جێگیربوون و ڕەگ داکوتانیدا هەبوو، (چیرۆکی هونەریی کوردی) بوو.

گەلاوێژ هەر لە یەکەم ژمارەی گۆشەیەکی تایبەتی بۆ چیرۆک داناوە، ناوی (چیرۆکی ئەم مانگە)ی لێناوە، لە سەرجەم ژمارەکانی ئەم گۆشەیە دەبینرێت، تا دوا ژمارەی کە (١١٦)یە، چونکە بە بەشێکی سەرەکیی ئەدەبی نوێیان زانیوە، هەر لەم گۆڤارەدا ئاوڕدانەوە لە چیرۆکی وەرگێڕدراو کارێکی زۆر بەجێبووە بۆ چاوکردنەوەی لاوەکانی، ئەوساش بە کەڵکبوو، چیرۆکە وەرگێڕدراوەکان هی ئەو نووسەرانە بوون کە ناوبانگیان هەبوو لە جیهاندا.... سەرنجی خوێنەر و نووسەرانی کوردیان ڕادەکێشا، چیرۆکەکانیش زیاتر لە زمانی ئینگلیزی و هەندێکیشیان لە زمانی عەرەبییەوە وەرگێڕدراون.

بابەتێکی دیاری ناوەرۆکی چیرۆکەکانی گۆڤاری گەلاوێژ ناکۆکی و ململانێی نێوان دووچینی سەرەکیی کۆمەڵ، کە دەرەبەگ و ئاغاکان لەلایەک و جوتیار و کاسبکارانی کوردستان لەلایەکی ترەوە بوو، کە وێنەی ژیانی پڕمەینەتی ئەو ڕۆژانەی شەڕی دووەمی جیهانی بوون، هەر لە پای ئەو بابەتەدا ڕەخنەگرتن لە نەریت و خوڕەوشتی دوواکەوتووی کۆمەڵایەتی بوو بە بابەتێکی تری چیرۆک لەو ماوەیەدا. لە چیرۆکەکانی (گەلاوێژ) ئەوەش دەبینرێت کە نووسەرەکان بەتەواوی لایەنگری جوتیارن هەروەها لە بەشێک لە چیرۆکەکان ئافرەت کراوە بە پاڵەوانی چیرۆک، هەندێک دیاردە خراپی کۆمەڵگە وەک: شیربایی و کچ فرۆشتن باسکراوە.

هەر ئەم چەشنە بایەخدانەی چیرۆکنووسانی کورد بەو جۆرە کێشە و دیاردە کۆمەڵایەتییانە بوو بە هۆی ئەوەی کە ڕاستەوخۆ چیرۆکی کوردی بەرەو ڕێبازی ڕیالیزمی هەنگاوبنێت، دیارترین چیرۆکنووسەکانی گەلاوێژ، (شاکر فەتاح، عەلائەدین سەجادی و برایم ئەحمەد)بوون.

## تەکنیك و زمانی دارشتنی چیرۆکەکان:

چیرۆکەکانی سەرەتای گۆڤاری گەلاوێژ لە ڕووی زمان و تەکنیکییەوە پێشکەوتنی ئەوتۆیان پێوە دیار نییە، واتا زمانی نووسینی چیرۆکەکان کوردی پەتی نییە، وەک زمانی نووسینی ئەو سەردەمە، پڕیەتی لە وشەی عەرەبی و فارسی، هەروەها لە ڕووی تەکنیکییەوە بەگشتی شێوازی چیرۆکەکان گێڕانەوەی ئاساییە و هیچ کاریگەرییەکی هونەری نوێی چیرۆکی پێوەنییە، زیاتر شێوەی ڕاپۆرت نووسینیان پێوەدیارە، یاخود گەلێ چیرۆکنووس هەوڵیانداوە باسێکی فۆلکلۆری یا ئەفسانەیی بێنن بەرگی چیرۆکێکی هونەری بەبەردا بکەن.

بەڵام دواتر زمانی نووسینی چیرۆکەکانی گۆڤاری گەلاوێژ بەرەو کوردی پەتیی ڕەوان دەڕوات، پاکدەکرێتەوە لە وشەی بێگانە لە جێگایان وشەی کوردی ڕەسەن یان وشەی گونجاو بەکارهێنراوە. هەروەها شێوەی هونەری نوێ و تازەتر بەکارهاتووە، واتا دەتوانین بڵێین چیرۆکەکانی گەلاوێژ لە ڕووی تەکنیکی هونەرییەوە لەچاو پێش خۆیان بەرەوپێشچوون و سیمای هونەری نوێیان پێوە دیارە، ڕستە و وەسفەکان بەسۆز و کاریگەرن و زنجیرەی باسەکان هەر لەسەرەتاوە تا ئەنجام بەیەکەوە بەندن و خوێنەر ڕادەکێشن بۆ چێژ لێوەرگرتنیان.

## چیرۆکی کوردی لە گۆڤاری هاوار ( ١٩٤١ - ١٩٤٣ )ز

گۆڤاری (هاوار) لە ساڵی (١٩٣٢)ز لە شام دەردەچوو لە ساڵانی(١٩٤١ تا ١٩٤٣)ز بایەخی زۆری بە بڵاوکردنەوەی چیرۆک داوە لە نرخ و بەهای ئەم هونەرە تازەیە باش تێگەیشتووە.

لە لاپەڕەکانی ئەم گۆڤارەشدا چەند چیرۆکنووسی بەتوانا و بەهرەمەند هەڵکەوتن کە دیارترینیان (جەلادەت بەدرخان، کامەران بەدرخان، قەدری جان، ئوسمان سەبری و نورەدین زازا.... هتد) بوون چیرۆکەکانی گۆڤاری هاوار بە زاری کرمانجی سەروو نووسراون و هەندێکیان بە چیرۆکی هونەری دادەنرێن، چونکە پلەی هونەرییان بەرزە، ئەوانی تریش سیمای چیرۆکی فۆلکلۆری کوردییان پێوەدیارە بەشێکیشیان بە زمانی گیانداران نووسراون...

لە ڕووی ناوەڕۆکەوە زیاتر هەوڵیانداوە، پرسی نەتەوایەتی و خەباتی چینایەتی بخەنەڕوو، ڕەخنە لە ناهەمواری باری کۆمەڵگە بگرن، هەروەها دەردی هەژاری و نەخوێندەواری بخەنەڕوو، ئەم گۆڤارەش بایەخیداوە بە چیرۆکی وەرگێڕاو بەتایبەتی لە زمانی فەڕەنسی و عەرەبییەوە دەکرانە کوردی، هەندێک جاریش هەر چیرۆکە کوردییەکان لە هەمان ژمارەدا کراون، بە فەڕەنسی کە ئەمەش ئەزمونێکی تازە بوو لە ئەدەبی کوردیدا.

لە ڕووی تەکنیکیشەوە بەشی زۆری چیرۆکە نووسراو و بڵاوکراوەکان لە ئاستێکی هونەری پێشکەوتوودان و تەواو و تۆکمەن چونکە چیرۆکنووسەکان زمانی فەڕەنسی و ئەڵمانی و ئینگلیزییان زانیوە.

## قۆناغی دووەم ◂ چیرۆکی هونەریی کوردی لە ساڵی (١٩٥٨- ١٩٧٠)ز

لەم قۆناغەدا بەدواوە بەهۆی ئاڵۆزبوونی باری سیاسیی وڵات و سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلول لە ساڵی ١٩٦١ز بەربەرەکانی ئەدەبی کوردی و چاپەمەنی کوردی دەکرا، ئەم بارودۆخەش کە بەسەر مێژووی نەتەوایەتیماندا هات جۆرێک لە نائومێدی باڵی کێشا بەسەر ئەدەبی کوردیدا و چەند ساڵانێکی خایاند، دیارە چیرۆکی کوردیش کپی و سستی و دواکەوتنی بەخۆیەوە بینی، بەڵام ئەم بارودۆخە هەر وا نەمایەوە، لە ناوەڕاستی ساڵانی شەستدا چیرۆکی کوردی تا ڕادەیەک پشوی پیاهاتەوە، چەند گۆڤار و ڕۆژنامەیەکیش دەرچوون و زەمینەیەکی لەباری بۆ ڕەخسا کە جارێکی دیکە پێشبکەوێتەوە.

### چیرۆکی کوردی لە گۆڤاری شەفەق (١٩٥٨)

لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٨ز لە شاری کەرکوک گۆڤاری (شەفەق) دەرچوو، کە ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لە پێشخستنی چیرۆکی هونەریی کوردی بۆ نمونە: گرەوێکی ڕێکخست بۆ باشترین سێ چیرۆکی کورت بۆ ئەم مەبەستەش، سێ خەڵاتی تەرخانکرد کە لە ئەنجامدا چیرۆکی (چای شیرین)ی (حسین عارف) پاداشتی یەکەمی وەرگرت، کە بەناوی خواستراوی (محمد صدیق عارف) بڵاوکرایەوە، چیرۆکی (چەندم لێ ئەستێنی)ی (مستەفا صالح کەریم) پاداشتی دووەمی پێدرا، چیرۆکی

(شەوێکی درێژ)ی (محەمەد ساڵح دیلان)ی شاعیریش پاداشتی سێیەمی پێدرا.
لەم ماوەیەدا چەند چیرۆکنووسێک بۆ یەکەمجار دەستیاندایە بڵاوکردنەوەی چیرۆکی کورت، لە قۆناغەکانی دواتریش هەر ناویان دەدرەوشێتەوە وەک (حسێن عارف، جەمال بابان، محەرەم محەمەد ئەمین، حەسەنی قزڵجی ... هتد).
لەم قۆناغەدا چەند چیرۆکنوسێک بۆ یەکەمین جار چیرۆکی مامناوەندی بڵاودەکەنەوە و جێگیریدەکەن لەوانە (جەمال بابان) بە چیرۆکی (خانزاد ، پەڵە هەورێکی چڵکن) و (جەمال نەبەز)یش بە چیرۆکی (لالۆ کەریم) و (محمد صالح سعید) بە چیرۆکی (کاروانی)... (کە ئەم چیرۆکانە ماوەی ڕوداوەکان و ژمارەی کەسەکانیان لە چیرۆکی کورت زیاترە، بەڵام ناگەنە چیرۆکی درێژ واتا (ڕۆمان)).
دەبێت ئەوەش بزانین، کە پێشتر دوو چیرۆکی مامناوەندی بە ناوی (لە خەوما) ی (جەمیل صائیب) ساڵی (١٩٢٥)ز لە (١٩٧٥)ز چاپکراوە و (مەسەلەی ویژدان) ی (ئەحمەد موختار جاف) لە ساڵی (١٩٢٩)ز نوسراوە و لە ساڵی (١٩٧٠)ز چاپکراوە. بەڵام لەبەرئەوەی لەکاتی خۆیدا بە کتێب بڵاونەکراونەتەوە، لە قۆناغی خۆیاندا جێگیر نەکراون.

## چیرۆکەکانی ئەم سەردەمە دوو جۆری سەرەکین:

هەندێک لەو چیرۆکانە زۆر سادەن و بابەتەکانیان دوور لە ڕوخساری هونەری خراونەتە بەرچاو، لە بازنەی نائومێدی دەخولێنەوە و پێشکەوتنیان بەدەست نەهێناوە. بەشێکی تریشیان گەشەو پێشکەوتنیان پێوە دیارە، چ لە ڕووی ناوەرۆک و ڕواڵەتی هونەری و ڕەوانی زمانەوە بێت، لە ڕووی ئەوەی کە مۆرکی کوردەوارییان پێوە دیاربێت، قارەمانەکانیان کەسانی ناو کۆمەڵی کوردەواری بوون، ڕوداوەکانیش ڕوداوی سەردەمەکە بوون، ناوەرۆکی چیرۆک لەم قۆناغەدا بایەخی بە کێشەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و چینایەتی سەردەمەکە داوە.
لەم قۆناغە بەدواوە چیرۆکنووسەکان هەوڵیانداوە زۆر بە ئاشکرا باسی بابەتە سیاسییەکان بکەن، لەبەرئەوەی چیرۆکنووسەکان زۆربەیان لەگەڵ شۆڕشی کورد و سەر بە بزووتنەوەی نیشتمانی بوون، چ بە بیروباوەڕ بێت، یان بە کردار، ڕۆژانەش

بە چاوی خۆیان چەوساندنەوە و ئەشکەنجەدانی گەلەکەیان دەدیت، بەدەستی ڕژێمی داگیرکەری کوردستان، ئەمەش بوو هۆی ئەوەی کە نرخی هونەری چیرۆکەکان بێتە خوارەوە، لە داهێنان بکەوێت، زمانی چیرۆکەکان سادە بێت و شێوە و تەکنیکیان لاواز بێت. بە ئاشکراش مەبەست بدەن بە دەستەوە.

هەندێک جاریش بارودۆخی سیاسی پوختی و ڕەوانی پێشووی لاوازکردووە لە ڕووی دارشتندا چیرۆکەکانی بەرەو چڕکردنەوە بردووە تا ڕادەیەکیش ڕەمزیان بەکارهێناوە.

## قۆناغی سێیەم چیرۆکی هونەریی کوردی لە ساڵی (١٩٧٠- ١٩٩١)ز

ساڵی (١٩٧٠)ز بە قۆناغێکی نوێ دادەنرێت لە مێژووی عیراق بە گشتی و گەلی کورد بەتایبەتی، لەبەرئەوەی لەو ساڵەدا بۆ یەکەمجار حکومەتی عیراق دانی بە مافە ڕەواکانی گەلی کورد نا، لە ڕێکەوتنامەی ١١ی ئازاری (١٩٧٠)ز کە لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کورد مۆری کردبوو، ئەمەش بەماوەی گەشەسەندن و ئاڵوگۆڕ دادەنرێت لە هەموو ڕوویەکەوە، دیارە زەمینەیەکی لەبار و ڕێگە خۆشکەر بوو بۆ ئەوەی چەندین دەزگای ڕۆشنبیری کوردی بێنەکایەوە، هەروەها کۆمەڵێک ڕۆژنامە و گۆڤاری جۆراوجۆر بە زمانی کوردی دەربچن، وەک ڕۆژنامەکانی (هاوکاری، بیری نوێ، ژین) هەروها گۆڤاری (بەیان، ڕۆژی کوردستان و ڕۆشنبیری نوێ) هەموو ئەمانەش زەمینەیان بۆ بڵاوکردنەوەی کۆمەڵێک چیرۆک لەو گۆڤار و ڕۆژنامانەدا خۆشکرد، لەگەڵ چاپکردنی چەندین کۆمەڵە چیرۆکێک.. کە دواتر بوون بە هۆی گەشەسەندنی زیاتری چیرۆکی کوردی لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە، خۆ دەرچوونی بەیانی (ڕوانگە) لە بەهاری ساڵی (١٩٧٠)ز یەکێک بوو لەو هەوڵ و ڕێبازە نوێیانەی کەوای کرد ژمارەیەک چیرۆکنووس پەیدابن جگە لە سازدانی کۆڕی ئەدەبی و زاڵبوونی کەشوهەوایەکی باش بۆ گفتوگۆکردن دەربارەی باری ڕۆشنبیری گشتی، ڕوانگە چیرۆکی کوردی لە سستی و دووبارەبوونەوە ڕزگارکرد. زەمینەیەکی نوێی بۆ چیرۆکی کوردی ئامادەکرد، دیوارێکی لەنێوان چیرۆکی کۆن و نوێدا دروستکرد. بە تەکنیکی تازە و بەکارهێنانی دیالۆگ*

(*) دیالۆگ: یەکتر دواندن

و مەنەلـۆگ* و چڕکردنــەوەی گێڕانــەوە و بەکارهێنانــی تەوژمــی هــۆش ئاســتی چیرۆکی کــوردی بەرزکردەوە.

لەســەرەتای ســاڵانی حەفتــادا کۆمەڵێــک چیرۆکنووســی قۆناغەکانــی پێشــوو بــە بۆچوونی تازە و کەرەســتەی تازەوە بەردەوامبوون، وەک: (حســێن عارف، محەمەد مەولود (مــەم)، کاکــە مەم بۆتانی و مســتەفا ســاڵح کەریم)..هەروەها چەند چیرۆکنووســێکی تازەش بــۆ یەکەمینجار دەســتیان بە نووســینی چیــرۆک کرد کە دواتــر ناوبانگیــان پەیداکرد وەک (محەمــەد موکــری، محەمــەد فەریق حەســەن، ڕەئــوف بێگەرد و شــێرزاد حەســەن...)

لــەم قۆناغــەدا دوو ڕوداوی تــر کاریگەرییــان بەســەر ڕەوتی چیرۆکــی کوردییەوە هەبــوو کــە ئەوانیــش شکســتی شۆڕشــی مەزنــی ئەیلــول بــوو لــە ناوەڕاســتی ســاڵانی حەفتــادا، هەروەهــا هەڵگیرســانی شــەڕی درێــژ خایەنــی هەشــت ســاڵەی نێــوان عیراق و ئێــران (١٩٨٠- ١٩٨٨)ز.

ئــەم ڕوداوانــە کاریگەرییەکی زۆریان بەســەر ئەدەبی کوردی بەگشــتی و چیرۆکی کــوردی بــە تایبەتــی هەبــوو، لەســاڵی (١٩٧٠)ز بــەدواوە بەشــێوەیەکی گشــتی بابەتەکانی چیرۆکــی کــوردی گۆڕانیــان بەســەرداهات هەرچەنــدە هەنــدێ لــەو بابەتانــەی پێشــوو دووبــارە دەبنــەوە بــەڵام لەپــاڵ کێشــەی کرێکار و خاوەنــکاری دەوڵەمەنــد، گیروگرفتــی شــاریش بــوو بــە هەوێنی چیــرۆک.. لەدوای ســاڵی( ١٩٧٥)ز و ســەرهەڵدانەوەی شــۆڕش جۆرێکــی تــر لە چیــرۆک پەیدابوو کــە چیرۆکــی (بەرگری لە مافــە ڕەواکانی گەلــی کورد) چونکــە دوای شکســتی (١٩٧٥)ز مــان و بوونــی گەلــی کــورد کەوتە مەترســی.

تاوانــی قڕکردن و لەناوبردن (جینۆســاید) بە ئاشــکرا بەرامبەر کــورد پەیڕەودەکرا و کــورد کەوتــە بەرامبــەر هێزێکــی دڕنــدەی وەک بەعــس کــە خــاوەن تازەتریــن چەکــی ســەردەم بــوو، بۆیــە چیرۆکنووســە کــوردەکان ئەرکێکــی پیرۆزیــان کەوتە سەرشــان کە ئەویــش داکۆکیکــردن بوو لــە مانی نەتەوەی خۆیــان و هانی خەڵکیان دەدا بــۆ بەرگریکردن و هۆشــیارکردنەوە لــە ڕووی بیروباوەڕەوە.

(*) مەنەلۆگ : خۆدواندن

## تەکنیکی چیرۆکی کوردی لە قۆناغی (١٩٧٠ - ١٩٩١):

١- چیرۆکی کوردی لەم قۆناغەدا سودی لە بەیت و لاوک و داستانی کۆنی فۆلکلۆری وەرگرتووە، کە ئەمەش ئاوڕدانەوەیەکی پیرۆز و سەرەتایەکی لەبار بوو بۆ چیرۆکنووسان، کە ئاوڕ لە گەنجینەی (بەیت و لاوک)ی کوردی بدەنەوە و بەکاریان بێنن بۆ خستنەڕوو و بەرجەستەکردنی هیوا و خەمەکانی مرۆڤی کوردی هاوچەرخ وەک لە چیرۆکی (لاوکی سوارە)ی (محەمەد فەریق حەسەن) و (بەیتی سمۆ)ی ڕەئووف بێگەرد و (هێلەگ)ی عەبدوڵلا سەراج...

٢- هەروەها لە چیرۆکی کوردی (جەفەنگ) واتە ڕەمز بە شێوەیەکی فراوان و بەربلاو بەکارهێنراوە، کە شێوەیەکە لە شێوەکانی تەکنیک بۆ جوانکاری بەکاردێت، هەروەها بۆ داپۆشین و شاردنەوەی ئەسڵی مەبەستی چیرۆکنووس بەتایبەتی لەو بارودۆخانە ڕێی دەربڕینی ڕاستەوخۆ لە نووسەران دەگیرێت، بەهۆی بارودۆخی سیاسیی توندوتیژی داگیرکەران بۆ نمونە (ڕەوەبەراز) ڕەمزی داگیرکەرە یان شەڕ خوازییە... (داربەڕو) ڕەمزی کورد و خۆڕاگری کورد و ڕەگ داکوتانی ئەوە لەناو خاکی کوردستان (ئەسپ) زۆر جار ڕەمزی شۆڕشە.

٣- چیرۆکی کوردی لەم قۆناغەدا سودی لە هونەری سینەما وەرگرتووە کە ئەمەش چەکێکی تازەی دایە دەست نوسەر، بووە هۆی شکاندنی قاڵبی خۆبەستنەوەی چیرۆکنووس لە کاتێکی دیاریکراو کە ئەمەش لە چیرۆکەکانی (ئەحلام مەنسور، ئەنوەر محەمەد تاهیر و عەبدوڵلا سەراج...) دەبینرێت.

٤- کاریگەریی ئەدەبی بێگانە واتە چیرۆکی گەلانی تر زۆر بەئاشکرا دیارە بەسەر چیرۆکەکانی ئەم قۆناغەدا، بەتایبەتی چیرۆکەکانی ئەمریکای لاتینی و ئەڵمانی و ڕوسی.. بەشێوەیەکی ئاشکرا لە نیوەی دووەمی ساڵانی هەشتادا، ئەمەش شتێکی ئاساییە چونکە دەکرێت، سود لە ئەزمونی چیرۆکی گەلانی تر وەربگیرێت بۆ دەوڵەمەندکردن و بەرەوپێشبردنی ئەزمونی چیرۆکی خۆمان.

٥- لە ڕووی زمانەوە، ناکرێت بڵێین کە زمان لای هەموو چیرۆکنوسانی ئەم قۆناغە وەک یەک یا بەیەک ئاست ناو بنرێت، بگرە لای چیرۆکنوسیش لە کۆمەڵە چیرۆکێکەوە وەک ئەوەکەی تر نییە، زمان لای هەندێک چیرۆکنوس، زۆر سادە و ساکارە درێژە پێدەری زمانی نووسینی چیرۆکە لە قۆناغەکانی پێشووتر لەگەڵ گۆڕانکارییەکی

کـەم، بـەڵام لای هەندێک چیرۆکنوســی تر زمانی نووســینی چیرۆکــەکان جیاواز تر و چڕوپڕتــر و تۆکمەتــر بوو، بۆ نموونە چیرۆکنوس (شـێرزاد حەسـەن) بەئاشـکرا دیارە خــاوەن زمانێکــی دەوڵەمەنــدی تایبەت بــە خۆیەتی، زمانی شــیعر زاڵە بەســەر زمانی چیرۆکەکانیــدا، کە خوێنەر ڕادەکێشــێت، وایلێدەکات چێژ لــە خوێندنەوەی چیرۆکەکانی وەربگرێت.

لــە هــەردوو کۆمەڵــە چیرۆکەکانــی (تەنیایــی) کــە لــە ســاڵی ١٩٨٣ز و (گوڵــی ڕەش)، کــە لــە ســاڵی ١٩٨٩ز بڵاوکراونەتــەوە دیــار و بەرچــاوە...

لای (حســێن عارف)زمانی نوســینی چیرۆک تۆکمە و بە پێــزە، بەتایبەتی لە کۆمەڵە چیرۆکەکانی (تویێشــووی ســەفەرێکی ســەخت)ە ســاڵی (١٩٧٩) و (گەلەگورگ) کە لە ســاڵی ١٩٨٣ز بڵاوکراوەتــەوە، بەتایبەتی لە کۆمەڵە چیرۆکــی (گەلەگورگ) زمان زۆر دەوڵەمەندتــر و شــیرینتر و سەرنجڕاکێشــترە، لەچــاو هەموو چیرۆکەکانی پێشــوتری.

# ”ڕۆمـان لە ئەدەبی کـوردیدا“

ڕۆمـان واتـە چیرۆکی دریـژ، ڕوداوەکانـی زۆر چڕوپڕن، مـاوەی ڕوداوەکانی زۆر دوور و درێژتـرن لـە هـی چیرۆکـی کـورت و چیرۆکـی مامناوەنـدی، هەروەهـا ژمارەی کەســەکانی لـە هـی چیرۆکـی کـورت و مامناوەنـدی زیاتـرن.

ڕۆماننوسـین یەکێکـە لـە هونـەرە ئەدەبییـە گرانـەکان، لـە سـەدەی حەڤدەهەم لە ئەوروپـا سـەریهەڵداوە، بـەڵام چەرخـی زێڕینـی ڕۆمان لـە ئەوروپـا سـەدەی نۆزدەهەم و نیـوەی یەکەمـی سـەدەی بیسـتەمە، زۆر لـە ڕەخنەگـران ڕۆمـان بە داسـتانی سـەدەی تـازە ناودەبـەن، نوسـینی ڕۆمـان لەناو گەلانـی خۆرهەڵات لـە چاو گەلانـی خۆرئاوا زۆر دواکەوتـووە.... لـە کاتێکـدا دەیـان ڕۆماننوسـی نـاودار لـە ئەوروپـا و لە هەمـوو جیهان ناوەکانیـان دەدرەوشـێتەوە، ڕۆمانەکانیان بـە بەردەوامی وەردەگێردرێن بۆ سـەر زۆربەی زمانەکانـی جیهـان، کەمتـر نـاوی ڕۆماننوسـانی عـەرەب و فـارس و تورک دەبیسـترێت، نوسـینی ڕۆمـان لەنـاو کـورد زۆر دواکەوتووتـرە لەچـاو نەتەوەکانـی تـری عـەرەب و فـارس و تـورک، چونکـە ئـەو بارودۆخـەی کە بۆ نوسـەرێکی عـەرەب و فـارس و تورک ڕەخسـاوە، هەرگیز بۆ نوسـەرێکی کورد نەڕەخسـاوە، بگرە زۆر جاریش نووسـەری کورد دژایەتیدەکرێـت و دەرفەتـی چاپکردنیـش بـۆ نوسـەری کـورد زۆر دژوار و ئەسـتەم بوو.

## سەرەتای ڕۆماننوسین لە ئەدەبی کوردیدا

بـۆ یەکەمجـار نوسـینی ڕۆمـان بـە زمانـی کـوردی لەنـاو کوردەکانـی یەکێتیی سـۆڤیەتی پێشـوو دەسـتیپێکردووە، یەکەمیـن هەوڵیـش لەلایـەن نوسـەری گـەورە عەرەبـی شـەمۆ دراوە، لـە سـاڵی ١٩٣٥ز ڕۆمانی (شـڤانی کورد) بـە زاری کرمانجیی سـەروو بە ڕێنوسـی لاتینی نوسـیوە، ئەم ڕۆمانە دواتر کراوە بە ڕوسـی و فەرەنسـی و ئەرمەنـی .... ڕۆمانـی (کـوردی ئەلەگـەز و بەربانـگ) دواتریـش (قـەڵای دمدم) لە سـاڵی (١٩٦٦ز) نوسـیوە، دوای عەرەبـی شـەمۆ چەنـد نوسـەرێکی کوردی سـۆڤیەتی تـر دەسـتیانکردووە بـە نووسـینی ڕۆمـان، لەوانـە (حاجـی جونـدی) کـە ڕۆمانـی

(هـەواریَ و بەهـار هـات)ی نوسـیوە، (عەلـی عەبدولڕەحمـان) ڕۆمانەکانـی (خاتـیَ خانـم و گوندی میٚرخاسـا)ی نووسـی، ئـەم ڕۆمانانە بەشـێکی زۆریـان کاریگەرییەکی ئەوتۆیـان نەبـووە لەسـەر ڕەوتی گەشەسـەندنی ڕۆمان لەنـاو کوردسـتاندا، چونکە تا درەنـگ نەگەیشـتوونەتە پارچەکانـی کوردسـتان. نووسـەرانی کورد لەنـاو پارچەکانی کوردسـتاندا ئـەم ڕۆمانانەیـان نەخوێندووەتـەوە نەیانبینیـوون.

ڕۆمانـەکان بـە شـێوەزاری کرمانجی سـەروو بە ڕێنووسـی لاتینی نووسـراون، زمانی نووسـینیان زۆر سـادە و ڕەوانە.

- بیروباوەڕی سۆشیالیزمی بەسەر ڕوداوەکان زاڵە.
- شـێوەی ڕۆمانـەکان گێڕانەوەیـە وەک داسـتان و چیرۆکە فۆلکلۆرییـەکان، چونکە بناغەی نووسـینی ڕۆمانەکان داسـتان و ئەفسـانە و حەکایەتـی فۆلکلۆری کوردین، دوورن لـە تەکنیکی تـازە و هاوچەرخ.

## قۆناغی جێگیربوون

لـە کوردسـتان هـەر وەک پێشـتر ئاماژەمان پێـدا، تا سـاڵانێکی درەنگی سـەدەی بیسـتەم هیچ ڕۆمانێک بە زمانی کوردی نەنوسـراوە، بەڵام دواتر دوو هەوڵی دیار هەن، دەتوانیـن بـە بناغەی بنیـادی ڕۆمانی کـوردی دابنێین، ئەگەر بە هەر بارێکدا تەماشـایان بکەیـن، ناتوانیـن بـە دەسـت پێشـخەرییەکی گەورەیـان نەزانیـن، ئـەو دوو هەوڵـەش هـەردوو ڕۆمانـی (پێشـمەرگە)ی (ڕەحیمی قـازی) و (ژانی گـەل)ی ( برایـم ئەحمەد)ن.

ڕۆمانـی (پێشـمەرگە) لە سـاڵی ١٩٦٠ز لە شـاری بەغدا چاپکراوە، کـە ڕوداوەکانی دەربـارەی سـەردەمی دامەزراندنـی (کۆمـاری کوردسـتان)ە لـە دەوروبـەری سـاڵی ١٩٤٦ز، چونکـە نوسـەر خـۆی لە لەناو جەرگـەی ڕوداوەکان بوو، بۆیە لـە خەباتی ئەو سـاڵانەی گەلـی کـورد دەدوێـت و ڕوداوەکان تێکـەڵ بـە چەند کێشـەیەکی تـر دەکات، بەتایبەتـی کێشـەی جوتیـار لەگـەڵ دەرەبەگدا.

لـە سـاڵی ١٩٧٢ز ڕۆمانی(ژانـی گـەل)ی برایـم ئەحمەد لـە بەغدا چاپکرا، نوسـەر خـۆی دەڵێـت لە سـاڵی (١٩٥٦)ز نوسـیویەتی بـەڵام لەبـەر نەبوونی دەرفەتـی گونجاو

نەیتوانیوە لە کات و سەردەمی خۆیدا چاپیبکات. ئەم ڕۆمانە زیاتر لە (ڕۆمانی پێشمەرگە) دەنگی دایەوە و لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو کاتە کۆمەڵێک وتار و لێکۆڵینەوەی لە بابەت بڵاوکرایەوە، پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت لە ساڵی ١٩٧٦ ز ڕۆمانی (قەڵای دمدم)ی عەرەبی شەمۆ، لەلایەن (شوکر مستەفا) لە زاری کرمانجیی سەروو بۆ زاری کرمانجی خواروو وەرگێڕدراوە.

زمانی نوسینی ڕۆمانە کوردییەکان لەم قۆناغەدا زمانێکی تۆکمە و کوردییەکی زۆر ڕەوانە، خوێنەر بۆ خۆی ڕادەکێشێت. ناوەڕۆکی ئەم ڕۆمانانە سیما و شەقڵی خەباتی نەتەوایەتییان پۆشیبوو، ڕوداوەکان خۆماڵین و لەناوجەرگەی کۆمەڵی کوردەواری هەڵهێنجراون، شێوەی نووسین زیاتر گێڕانەوەیە، دوورە لە تەکنیکی هاوچەرخ و تەمومژ و ئاڵۆزی.

## قۆناغی گەشەسەندن

ئەم قۆناغە لە هەشتاکانی سەدەی بیستەم دەستپێدەکات و دوو دیاردەی ئاشکرای پێوە دیارە:

١) ژمارەی ڕۆمانی خۆماڵی نووسراو بە زمانی کوردی زیاتر دەبینرێت لە چاو قۆناغەکانی پێشووتر.

٢) ژمارەی ڕۆمانی وەرگێڕاو لە زمانی بێگانە بە شێوەیەکی بەرچاو زیاددەکات.

ئەم دوو دیاردەیە لەم سەردەمەدا دوو دیاردەی دڵخۆشکەربوون بۆ ئەوەی ببنە ڕێخۆشکەر بۆ گەشەسەندنی ڕۆمان بە زمانی کوردی، چونکە پێشتر ژمارەی ڕۆمان بە زمانی کوردی لە پەنجەکانی دەست تێنەدەپەڕین. کە ئەمانەن:

١- حسێن عارف لە ساڵانی هەشتا هەردوو ڕۆمانی (شار و ئەندێشەی مرۆڤێک)ی چاپکرد

٢- عەزیزی مەلای ڕەش ( کوێخا سێوێ و غەوارە) چاپکرد.

٣-خەسرو جاف (کۆردەرە و هیچ) ی چاپکرد.

٤-عەبدوڵڵا سەراج (هەڵکشان بەرەو لوتکە)ی چاپکرد

٥- دکتۆر نافیع ئاکرەیی (بوهژین)ی چاپکرد

٦-(محەمەد موکری) ڕۆمانەکانی (سەگوەڕ و تۆڵە و هەرەس) لە شاخ دوور لە چاودێری حکومەت چاپکرد

٧- (حەمە کەریم عارف)یش (کۆچی سوور) لە شاخ دوور لە چاودێری حکومەت چاپکرد.

٨- محەمەد ئۆزون لە سوید ڕۆمانی (مرنا کالەکی ڕەند و هاوارا دیجلەیێ) بە زاری کرمانجی سەرو و چاپکرا.

دیارە ڕوداوی سیاسیی و باسی خەباتی ڕەوای کورد، ژیانی پێشمەرگایەتی نێو شاخ بوو بە هەوێنی چاوهەڵهێنانی ئەم بەرهەمە تازانە، لەم ڕۆمانانەدا باس لە کێشەی گوندنشینەکان دەکرێت، وەک ڕۆمانەکانی (عەزیزی مەلای ڕەش).

زمانی ڕۆمانەکانیش پاراوتر و پوختر و چڕتر کراونەتەوە ئەمە لەپاڵ دیاردەی بایەخدان بە زارۆچکە ناوچەیی جوتیاران، ئەگەرچی لەم قۆناغەشدا شێوازی گێڕانەوە بە زۆربەی ڕۆمانەکانەوە دەبینرێت هەست بەوەش دەکرێت، کە ڕۆماننوسەکان بایەخیان بە تەکنیکی نوێ و خۆدواندن (مەنەلۆگ) داوە سەرکەوتووانەش بەکاریانهێناون.

دەبێت ئەوەش بزانین کە ئەم قۆناغە ڕێگەی خۆشکرد بۆ ئەوەی ڕۆمانی کوردی لە قۆناغی نۆهەتەکان زۆر زیاتر پێشبکەوێت، گەشەسەندنێکی وا بەخۆیەوە ببینێت کە هەرگیز گەشەسەندنی وای بە خۆیەوە نەبینیبێت.

لەپاڵ ئەم ڕۆمانە کوردییانەدا کۆمەڵێک ڕۆماننوسی کورد هەن، بە زمانی بێگانە ڕۆمانیان نوسیوە بە ڕەچەڵەکیش کوردن و ناوبانگی جیهانییان هەیە (یەشار کەمال) کە بە تورکی دەینوسی و هەندێک لە ڕۆمانەکانی کراون بە کوردی وەک (ئەفسانەی چیای ئاگری، حەمەدۆک، کاریتە ... هتد) ... (سەلیم بەرەکات) بە عەرەبی دەنوسێت کە کوردێکی سوریایە، ڕۆمانی (پەڕ ، دلشاد)نوسیوە و کراون بە کوردی، (ئیبراهیمی یونسی) بە فارسی دەنووسێت، ڕۆمانی (دایکم دووجار گریا) نوسیوە و کراوە بە کوردی و ئەم ڕۆمانەی دەربارەی کارەساتی ئەنفالی گەلی کوردە لەلایەن ڕژێمی بەعس، هەروەها(عەبدولمەجید لوتفی) کە بە زمانی عەرەبی ڕۆمانی (پێشبینی لێزانە قەرەجەکە)ی نوسیوە و لەلایەن (شوکر مستەفا) کراوەتە کوردی.

ئەگەر چی ئەم ڕۆمانانە لە ڕووی زمانەوە بە کوردی دانانرێن، بەڵام لە ڕووی ناوەرۆکەوە بەشێکی زۆریان باسی ژیان و خەباتی ڕەوای گەلی کورد دەکەن.

# "ڕەوانبێژی"

ڕەوانبێژی قسـە و هۆنراوەی ڕەوان و جوان و کاریگـەر بێ لەگەڵ بارودۆخی گوێگـر و هەڵوێسـتی قسـەکردنەکە بگونجێـت، بۆئـەوەی مەبەسـتەکەی بەڕوونـی لـە خوێنـەربگەیەنێـت و چێـژی پێببەخشـێت و کارتێبـکات. ئەمەش بە هەڵبژاردنـی (وشـەی لەبار و داڕشـتنی تۆکمـە و ڕێکخسـتنی ژیریێژییانـە دێتەدی).

زانسـتی ڕەوانبێژی لەو هونـەرو دەسـتورو بنەمایانە دەکۆڵێتـەوە کە دەبن بە مایـەی ڕەوانـی و جوانـی و کاریگەری قسـە و پاراسـتنی لـە لێلی.

لێرەدا باسی هەندێك لە بابەتەکانی ڕەوانبێژی دەکەین:

## یەکەم ڕەگەزدۆزی

دوو وشـە یـان زیاتـر لـە شـێوەدا، وەک یەک وا بـن یان لەیـەک نزیک بـن، بەڵام واتایـان جیابێـت. نمونـە:

ئەگەر خاڵت بڵێم مشکی خەتایـە
عەزیزی من ئەمەم عەینی خەتایە

(حاجی)

لـە کۆتایـی هـەردوو نیـوە دێردا، وشـەی (خەتا) هاتووە، هەردوو وشـەکە لە شـێوەدا یـەک شـتن بەڵام لـە مانادا جیـان. یەکەمیان (خەتا) شـوێنێکە لـە تورکسـتانی چین، کەچی دووەم بەمانـای گوناه و تـاوان هاتووە.

نمونەیەکی تر:

بە ئاه و گریان دیسان هاتەوە هەوری نیسان
جگەر پڕئاو و ئاور وەك عاشقی بێ قـەرار

(وەفایی)

لەم دێڕەدا ڕەگەزدۆزی لە وشەکانی (ئاو) و (ئاور – ئاگر) دایە. ئەم دوو وشەیە هەرچەندە لە شێوەدا تەواو وەک یەک نین، بەڵام لەیەک نزیکن. جیاوازییان تەنیا ئەوەیە کە وشەی (ئاور) یەک پیت (ر)ی کۆتایی لە وشەی (ئاو) زیاترە.

## جۆرەکانی ڕەگەزدۆزی

ڕەگەزدۆزیی دوو جۆری هەیە کە ئەمانەن:

» ڕەگەزدۆزی تەواو

» ڕەگەزدۆزی ناتەواو.

### أ ڕەگەزدۆزیی تەواو

لە ڕەگەزدۆزیی تەواو وشەکان لە ڕوخساردا واتە لە (ژمارەی پیت - جۆری پیت- ڕیزی پیت) وەک یەکن.

نموونە:

ئەوەی ڕێگەی لە کوردەکان گۆڕی

لەعنەتی خوا لە ئەلحەد و گۆڕی

(مەلای گەورە)

ڕەگەزدۆزیی تەواو لەنێوان وشەی(گۆڕی) ی کۆتایی نیوەی یەکەم و (گۆڕی) کۆتایی نیوەی دووەمدایە، ئەم دوو وشەیە ڕوخساریان وەک یەک وایە، بەڵام واتایان جیاوازە، واتای یەکەمیان (ڕێگە لێگۆڕین)ە کە کارە، بەڵام دووەمیان ناوە واتە(قەبر)...

### أ ڕەگەزدۆزیی ناتەواو

لە ڕەگەزدۆزیی ناتەواو وشەکان لە ڕوخساردا تەواو وەک یەک نین، بەڵام لەیەک نزیکن.

جیاوازییەکە لە یەکێک لەمانە ( ژمارەی پیت - جۆری پیت - ڕیزی پیت ) دەبێت:

» بۆی هەیە وشەکان لە ژمارەی پیتەکان جیاوازبن، واتە یەکێ لە وشەکان پیتێکی لەوی تر زیاتر بێت. زیادەکەش لە سەرەتا یان لە ناوەڕاست، یان لە کۆتایی وشەکە هاتبێت. نمونە:

مەعشوق تویی ب فەخر و نازی
عاشق تویی لێك بێ نیازی
(خانی)

ڕەگەزدۆزی لە وشەکانی (ناز) و (نیاز) دایە، دووەمیان (نیاز) یەک پیت (یـ) لە یەکەمیان (ناز) زیاترە و پیتی زیادەکە (یـ)کەوتووەتە ناوەڕاستی وشەکەوە.

» یان وادەبێت وشەکان لە جۆری پیتێک جیاوازبن، جا ئەو پیتە گۆڕاوە چ لە سەرەتا، یان لە ناوەڕاست، یان لە کۆتایی بێت. نمونە:

پیری بە تەنیا ڕەحمەتە
پیری و هەژاری زەحمەتە
(حەمدی)

لە دێرە شیعرەکەدا ڕەگەزدۆزیی ناتەواو لەنێوان وشەکانی (ڕەحمەتە) و (زەحمەتە) دا هەیە چونکە پیتی یەکەمیان جیایە.

» بۆی هەیە وشەکان لە ڕیزبوونی پیتەکان جیابن، نمونە:

خاترێکی شۆخ و خۆش و بێ غەم و جەمعم هەبوو
ئێستا بۆ زولفی کەسێ مەشقی پەرێشانی دەکا!
(نالی)

لە نیوەدێری یەکەمدا، ڕەگەزدۆزی لە وشەکانی (شۆخ) و (خۆش) دایە. ئەم دوو وشەیە لە ژمارە و جۆری پیتەکان وەک یەکن، بەڵام ڕیزی پیتەکان گۆڕاوە.

| | ١ | ٢ | ٣ |
|---|---|---|---|
| یەکەم | ش | ۆ | خ |
| دووەم | خ | ۆ | ش |

## ڕاهێنان

**لەم دێرە شیعرانەی خوارەوەدا، ڕەگەزدۆزی دەربهێنە و جۆرەکەی دیاربکە:**

١- ئەی خامە تەژی گەلەك درێژکر
ئەڤ نامە بەسە تە پڕ قرێژکر
(خانی)

٢- ئێمە هەر چەندە قەومێکی زۆرین
بەڵام چونکە قەومێکی خۆخۆرین
بۆیە دائیما وا لەژێر دەستی زۆرین
(بێکەس)

٣- کاوە کە هەڵی کرد ئاڵا
گەل لە قەڵای زۆردار ئاڵا
(کامەران موکری)

٤- شکانیان کەمانچەی دەستم
بەڵام زوو فریاکەوت هەستم
(کامەران موکری)

٥- ئەم وەتەن و ئاو و گڵە
پشت و ئەژنۆ و جەرگ و دڵە
(شێخ سەلام)

٦- قژ کاڵی، لێو ئاڵی، پرشنگی نیگا کاڵ
ئەی کچە جوانەکەی سەرگۆنا نەختێ ئاڵ
(گۆران)

## دووەم لێکچواندن

لێکچواندن لەسەر بنەمای بەراوردکردن هاتووە. بۆ ڕوونکردنەوە و چەسپاندنی سیفەتی شتێکە و لەگەڵ شتێکی تر بەراورد دەکرێت، کە سیفەتی مەبەستەکەی تێدا زاڵە، بۆئەوەی سیفەتەکە بەم بەراوردکردنە ڕوونبێتەوە و بەزێدەڕەویی دەربکەوێت.
نمونەیەک:

منیش ئارەزووی ئەوسام نەماوە عەشقم گۆڕاوە
دڵم هەروەکو گوڵی بێ باران سیس و ژاکاوە

(بێکەس)

لەم دێڕەدا، لێکچواندن لە نیوەی دووەمدا یە. (بێکەس) دەیەوێ باسی دڵی خۆی بکات. بۆ ڕوونکردنەوە دڵی خۆی لەگەڵ گوڵی سیس بەراوردکردووە. بابەتی باسەکە دڵی شاعیرە، ئەمە (لێچوو)ە، گوڵی بێ باران بۆ ڕوونکردنەوەی دڵی شاعیر هاتووە، ئەمە (لەوچوو)ە. سیفەتە هاوبەشەکە سیس و ژاکاویی (ڕووی لێکچوون)ە (هەروەکو) ئەوزاری لێکچواندنەکەیە.

### بنەماکانی لێکچواندن:

لێکچواندن بە گشتی چوار بنەمای هەیە:

١- (لێچوو) ئەمە بابەتی باسەکەیە. لە هەموو بنەماکان لە پێشترە، چونکە باس باسی ئەوە و ئەوانی تر بۆ خزمەتی ئەم هاتوون.

٢- (لەوچوو) ئەوەیان بۆ ڕوونکردنەوەی لایەنێکی (لێچوو) دێت، کە بەراوردەکەی لەسەر بنیاتدەنرێت.

ئەم دوو بنەمایە (لێچوو و لەوچوو) بنەمای بنچینەیین لە لێکچواندندا. بەبێ ئەم دووە لێکچواندن دروستنابێت هەر کام لەم دووە لابدرێت لێکچواندنەکە نامێنێت.

٣- (ڕووی لێکچوون) سیفەت و لایەنی هاوبەشی نێوان هەردوو بنەما بنچینەییەکەیە، ئەم سیفەتە لە لێکچواندنی ئاساییدا، لە (لێچوو) بێهێز و لە (لەوچوو) بەهێزە.

٤- (ئەوزار) وشەیەکە ڕۆڵی بەیەکەوە بەستنی هەردوو بنەمای بنچینەیی لێکچواندن (لێچوو و لەوچوو) دەبینێت. ئەمانەش هەندێ نمونەی ئەوزاری لێکچواندنن: (وەک، وەکو، هەروەک، لەوەدەکا، لەوەدەچێ، ئاسا، چون، وێنەی، چەشنی...).

ئـەم دوو بنەمایـەی دواوە (ڕووی لێکچـوون و ئـەوزار) بنەمـای بنچینەیــی نین، بۆیە دەشــێ باســبکرێن و دەشــێت باس نەکرێــن. نموونە:

دڵــم زنجیــر ئەکــەم ئەممــا لـــە یـــاری دڵڕوبــا چ بکەم؟
ڕەگم وشــکە وەکو پووشـــە، لە قـــووەی کارەبا چ بکەم؟

(قانیع)

لێکچوانـدن لـە نیـوەی دووەمدایـە (ڕەگم وشـکە وەک پووشـە..) قانیع ڕەگـی خۆی لە وشـکایەتیدا بـە پـوش چوانـدووە. بنەماکانـی لێکچواندنەکـە ئەمانەن:

١- ڕەگی شاعیر: لێچووە

٢- پـــووش: لەوچووە

٣- وشکایەتی: ڕووی لێکچوونە

٤- وەکو: ئەوزاری لێکچواندنە

## بنەما باسکراوەکانی لێکچواندن:

١. بۆی هەیە هەر چوار بنەمای لێکچواندن هاتبن وەك دوو نموونەکەی پێشتر.

٢. بۆی هەیە سێ بنەما هاتبن ئەمەش دوو جۆرە:

أ بـۆی هەیـە سـێ بنەمـا باسـکراوەکان (لێچـوو و لەوچـوو و ئـەوزار) بـن و ڕووی لێکچـوون نەهاتبێـت. نموونـە:

قەســەم بــەو شــەربەتی دیــداری پاکــت
شــەرابم عەینــی زەهــری مــارە بــێ تــۆ

(نالی)

لـە نیـوەی دووەمـدا، لێکچواندنەکە بریتییە لە (شـەرابم عەینی زەهری مـارە) بەبێ یار، شـەرابی خـۆی بە زەهری مار چوانـدووە. لـەم لێکچواندنەدا، تەنیا سـێ بنەما هاتوون.

١- شەرابی شاعیر: لێچووە

٢- زەهری مـــار: لەوچووە

٣- عــــەینی: ئەوزارە

(ڕووی لێکچواندن) کە کوشندەییە، نەهاتووە چونکە خوێنەر خۆی دەیزانێت.

**ب** بۆی هەیە سێ بنەما باسکراوەکان (لێچوو و لەوچوو و ڕووی لێکچوون) بن و ئەوزاری لێکچواندن نەهاتبێ، نمونە:

کـــوڕ ئاییـنەیـێ جەمالـێ زاتـــــن
کەچ مەظهـــــەرێ پورتەوا صیفاتن
(خانی)

لـە نیـوەی یەکەمـدا، لێکچواندن لـە (کـوڕ ئاییـنەیێ جەمالـێ ذاتن) دایە خانـی (کوڕ)ی بـە (ئاوێنە) چوانـدووە کە جوانی زات پیشـاندەدەن.

١- کوڕ: لێچووە
٢- ئایینە: لەوچووە
٣- جەمالی زات پێشاندان: ڕووی لێکچوونە
(ئەوزار) نەهاتووە

**پ** بـۆی هەیـە تەنیـا دوو بنەمـا بنچینەییەکە (لێچوو و لەوچوو) هاتبـن و دوو بنەما نابنچینەییەکـە (ڕووی لێکچوون و ئەوزار) نەهاتبن وەک:

دەمێـك بـــوو چاوەڕێـــێ بەفرێکی وا بـــووم مژدەبـــێ بارێ
ســـەرم بەفـــرە کەچـــێ هێشـــتا شـــەڕە تۆپەڵمـــە بۆ یــــارێ
(پیرەمێرد)

لێکچواندن لە (سەری شاعیرە) کە بە (بەفر)ی چواندووە.
سەرم: لێچووە
بەفر: لەوچووە
ئەوزار و ڕووی لێکچوون نەهاتووە.

## ڕاهێنان

**لەم دێرە شیعرانەی خوارەوەدا، لێکچواندن دەربهێنە و بنەماکانیان لەیەك جیابکەرەوە:**

١- ئـەمـن کێوم، سـەرم شـاخە، هـەناسـەم
نـەسـیمـە، دیـدە کانی، مـێزەرم تـەم
(حاجی قادری کۆیی)

٢- قـەلبێ مە شـوبهێ زێڕێ ژ فەیزاتە جەلاگرت
ما ڕووسـیە و سـیفر سیفەت ڕەنگێ سـەداگرت
(جزیری)

٣- چ سـرێکت لە ناو دڵدا حەشـارداوە بە پەنهـانی
کە چاوت چەشنی ئاوێنە وەها بێ پەردە درکانی
(ئەحمەد هەردی)

٤- تاکـەی چـون مـەجنون وێڵی هـەردان بم؟
تاکـەی خـەمـزەدەی باری هیـجران بـم؟
(مەولەوی)

٥- بـەژن و باڵاکـەت نمـونەی هەیکەلی یۆنانییە
لار و لەنجەت، مۆسیـقایە، بەستەیە، گـۆرانییە
(هەردی)

٦- نـەیلـوفـەر دل، تـو ئافـتابی
تـەن شـبهی کـەتان، تـو مـاهتابی
(خانی)

## سێیەم خواستن

خواستن بەکارهێنانی وشەیەکە، بۆ دەربڕینی مانایەکی تر، جگە لەو مانایەی کە لە بنجدا بۆی دانراوە، لە خواستندا. تەنیا یەکێ لە دوو بنەما بنچینەکەی لێکچواندن هاتبێت و ئەوی تر نەهاتبێت*.

نمونە:

ئیلاهی! نەرگزا مەی مەست و نازك
ژ دەستی خوارو بەدخواهان بپارێز

(جزیری)

(ئیلاهی: خودایە ، مە: ئێمە ، ژ: لە ، خوار: لارو خراپ ، بەدخواهـ: بەد نیاز).

خواستن لە وشەی (نەرگز) دایە. مانای وشەکە جۆرە گوڵێکە. جزیری یارەکەی خۆی بە (نەرگز) چواندووە (یار) (لێچووە)، (نەرگز) (لەوچووە) (مەست و نازک) (نیشانەی خواستنە) (ئەوزار) نەهاتووە. بەڵام لەو لێکچواندنەدا دیارە (جزیری) لە دوو بنەما بنچینەییەکە (یار ، نەرگز) تەنیا یەکێکی هێناوە (لەوچوو- نەرگز). ئەوی تری فرێداوە (لێچو- یار) لەم دێرە شیعرەدا (نەرگز) بۆ یار بەکارهاتووە.

نمونەیەکی تر:

وا نەزانی دەستی غەم یادت لە دڵدا دەرژەکا
ئەشکی خوێنیم دەلیلە بۆ کەسێ باوەڕ نەکا

(هەردی)

لەم دێرە شیعرەدا خواستن لە (دەستی غەم) دایە. لەبەر وشەی (دەست) یەکسەر بیرمان بۆ ئەوە دەچێت کە (غەم) بە (مرۆڤ) چوێنراوە. غەم (لێچووە). مرۆڤ (لەوچووە). ئەمە دوو بنەما بنچینەییەکەی لێکچواندنن. لەم دووەدا تەنیا (لێچوو- غەم) هاتووە، (لەوچوو – مرۆڤ) نەهاتووە.

(*) لە خواستندا دەبێت نیشانەیەک هەبێت تاکو بزانین وشەکە بۆ واتای بنجی خۆی بەکارنەهاتووە.

## جۆرەکانی خواستن

خواستن لەڕووی دەرکەوتنی یەکێ لە دوو بنەما بنچینەییەکەوە دەکرێت بە دوو جۆر:

### ١- خواستنی ئاشکرا

ئەو خواستنەیە کە لە دوو بنەما بنچینەییەکەی لێکچواندن تەنیا (لەوچوو) هاتبێت و (لێچوو) نەهاتبێت. نمونە:

هەرچەند گوڵ سیس ئەبێ بگرین
ئاڵتونی دار ئەرژێ بگرین
(گۆران)

خواستن لە وشەی (ئاڵتون) دایە. لەبەر وشەی (دار) دەزانین مەبەست لە وشەی (ئاڵتون) ئاڵتونی ڕاستەقینە نییە، بەڵکو گەڵای زەردە. واتە گۆران گەڵای زەردی بە ئاڵتون چواندووە: گەڵای زەرد (لێچووە) ئاڵتون (لەوچووە). لەم دووە (لێچوو- گەڵای زەرد) فرێدراوە و تەنیا (لەوچوو- ئاڵتون) باسکراوە. ئەم جۆرە خواستنە، کە (لەوچوو) هاتبێت و (لێچوو) فرێدرابێت پێی دەگوترێت (خواستنی ئاشکرا).

### ٢- خواستنی درکاو

ئەم جۆرە خواستنەیە کە لە دوو بنەما بنچینەیەکەی لێکچواندن تەنیا (لێچوو) هاتبێت و (لەوچوو) نەهاتبێت.

تا نەگریا ئاسمان و تەم وڵاتی دانەگرت
گوڵ چەمەن ئارا نەبوو، هەم لێوی غونچە وا نەبوو
(نالی)

(چەمەن ئارا: ڕازێنەرەوەی چیمەن، وانەبوو: نەکرابوەوە)

لە نیوەی یەکەمدا خواستن لە (تا نەگریا ئاسمان) دایە. لەبەر وشەی (نەگریا) دەزانین (ئاسمان) بە (مرۆڤ) چوێنراوە. ئاسمان (لێچووە)، مرۆڤ (لەوچووە). لێرەدا تەنیا (لێچوو – ئاسمان) هاتووە و (لەوچوو – مرۆڤ) فرێدراوە، ئەوەندە هەیە (گریان)ی مرۆڤ دراوە بە ئاسمان کە نیشانەی خواستنەکەیە.

لە نیوەی دووەمدا، خواستن لە (لێوی غونچە وانەبوو) دایە لەبەر وشەی (لێو) دەزانین (غونچە) بە (مرۆڤ چوێنراوە). غونچە (لێچووە). لێرەدا تەنیا (لێچوو – غونچە) هاتووە و (لەوچوو – مرۆڤ) نەهاتووە. (لێو) نیشانەی خواستنە.

## ڕاهێنان

**لەم دێڕە شیعرانەدا خواستن دەربهێنە و بنچینەکەی ڕوون بکەوە و جۆرەکەی دیاربکە:**

١- لایدا ســـەرپۆش و پـــەرچـەمـــی بای شـــەماڵ
مــانگێك هـــاتــــە دەر پـــرلــەخـــەت و خـاڵ!!
(حەمدی)

٢- شـــێرلە بێشــــە دەرپەڕی دەســـت بە خـــەنجــەر
ڕوو بـــەڕوو ئـــــەیدا لــە زومـــڕەی دوژمنــــان
(سالم)

٣- کـــە دەســـتی ڕۆژگاربـایـــدا ســـەری مـــــن
ســـەری شــــوشــــەی شـــەراب وا چـاکە بادەم
(هێمن)

٤- ڕۆژتــــە ئـــەی بــادی نەورۆزی لەبنی بەفری گران
کانی پێی سڕبوو، چناریش دەستی چوو، پەنجەی تەزی
(حاجی)

٥- ئـــەڵێن ســاڵ دوانــــزە مــــانـــگــــــــە
مـــن مــانگــم دی چـــــــواردە ســـــاڵە
(پیرەمێرد)

٦- چاوەکەم ئەمڕۆ لە گوڵشەن گوڵ بەعیشوە خۆی نواند
نەك نمەك گیربم بە مەرگی تۆ قەسەم هیچ نەمدوانـــد
(حەریق)

## چوارەم دژیــەك

دوو وشــە دژ و پێچەوانــەی یەکتــرن. وەك: (گەورە و بچوك، پاك و ناپــاك، مردن و ژیان، بەهێز و بێهێــز...) نمونە:

مــەژی بــۆ مردن، بمــرە بـــۆ ژیان

چـــۆن قازانج ئەکەی تا نــەکەی زیان

(برایم ئەحمەد)

| لەم دێرە شیعرەدا دژیەك لەنێوان ئەم وشانە هەیە: | | |
|---|---|---|
| مردن | X | ژیان |
| قازانج | X | زیان |
| ئەکەی | X | نەکەی |

## جـــۆرەکانی دژیەك

دژیــەك دوو جــــۆرە:

### أ- دژیــەکی ئــەرێ

دوو وشــەکە هەریەکــە لــە رەگەزێکی ســەربەخۆن، لە مانــادا دژ و پێچەوانــەی یەکترن وەك (خەنــدە و گریان، تاڵ و شــیرین، ســەرکەوتن و ژێرکەوتن......هتد) وەك:

چ رونــاکی بــێ، چ تــاریکی، چ نــزمی بێ یــا بــەرزی

بە خۆشی بێ وەیا تاڵی هەمووی ئەڕوا لەسەر ئــەرزی

(پیرەمێرد)

| دژیەکی ئەرێ لەم دێرە شیعرەدا ئەمانەن: | | |
|---|---|---|
| ڕوناکی | X | تاریکی |
| نزمی | X | بەرزی |
| خۆشی | X | تاڵی |

## ب- دژیەکی نەرێ:

ئەوەیە دوو وشەکە بە نەرێکردن بووبن بە دژیەک وەک :

پاک × ناپاک ، مەرد × نامەرد ، بڕۆ × مەڕۆ ، بەهێز × بێهێز

نمونە:

ئەی کوردی جەفا دیدە بەسە قەیدی ئەسارەت

نادان بە کوتەک حاڵی دەبێ، دانا ئیشارەت

(قانیع)

دژیەک لەنێوان (دانا × نادان) دایە. کە هەردوو وشەکە لەیەک ڕەگەزن بەڵام بە نەرێکردن بوونەتە دژیەک.

## ڕاهـێنان

**لەم دێڕە شیعرانەدا چی دژیەك هەیە دەریبهێنە و جۆرەكەی دیاربكە:**

١- گـەلێکم ڕۆژگاری تـاڵ و شـیرین ڕابـوارد ئاخـــۆ
مـەرگ مـەودا دەدا دیسان ببینم سـەردەمـێکی تـر
(هێمن)

٢- ئــەوەی ڕزقی مــوقـــەڕەرە بـــۆ خۆی دێ
ســـەد دەفـعـــە بخـوازێ یــا نـەخــوازێ
(حاجی)

٣- یارم لـە ئەندەروون هات دەســتی ڕەقیب لە دەستا
غــەمناك و شــادمانم، ڕەحمەت عەزابی هێنــا
(سالم)

٤- نێرگـزێن شــەنگ و مـــەســتن چــەپ و ڕاســـت
ســاقــیان جــام و دەســـتن چــەپ و ڕاســـــت
(جزیری)

٥- لـە گــریەی زۆری مــن و خــەندەی کــەمی تۆ
هــــەمــوو دنیــا بووەتــە شـــین و ڕۆڕۆ
(ڕەمزی)

٦- ئــەگــەر دۆســـــتم، ئەگــەر دوژمــن بـزانم
ئــــەوەنـدەم تێگـەیێنـــە کـامـــەیـــانم
(مەدهۆش)

## پێنجەم جوانیی بایس

دیاردەیەکە هۆی دروست و ڕاستەقینەی خۆی هەبێت، بەڵام ئەو هۆیە بخرێتە، لاوە بۆ جوانکردن و ڕازاندنەوەی شیعرەکە، هۆیەکی تری هونەرمەندانەی بۆ دروستبکرێت کە زۆر دوور بێت لە هۆیە دروست و ڕاستەقینەکەی خۆی.

وەک لەم هۆنراوەیە:

مانگی بەجێماو لە سەفەری شەو
زەردە لە ترسی قاسپە قاسپی کەو
(گۆران)

زەردبوونی مانگ لە بەرەبەیاندا دیاردەیەکی سروشتییە. بەڵام شاعیر هاتووە هۆیەکی تری بۆ دروستکردووە و دەڵێت مانگ لە ترسی دەنگی قاسپە قاسپی کەو ڕەنگی زەردبووە.

## ڕاهێنان

**لەم دێرە شیعرەنەدا جوانیی بایس دەربێنە و دیاردەکە دەستنیشان بکە و هۆیە جوان دروستکراوەکە ڕوونبکەوە:**

١- لە خـەوفی تەلعەتی، ڕۆژ هەروەکو شـێت
بـە ڕووزەردی هـەڵات و کـەوتــە کێوان

(نالی)

٢- شــەماڵ لە ترسـی شـنەی نسـێی سەخت
پـەنای بۆ باســك و پێدەشـــت هــێناوە

(دیلان)

٣- نــارنـــج و تـــورنـج شـــوبهــی زینی
زەربــویـی ل عیللـــــەتا ئـــــەڤـینی

(خانی)

٤- لــە لێوار حـــەوزا گـــوڵاڵە و بەیـــــوون
ســـــاوان، ئـەلـــەرزن، لـە تـاو نقووم بوون

(گۆران)

٥- پـەڵـەی گـــوڵاڵــە لە ترسـی چنـــور
نــاو جــەرگی ســوتا و ڕەش هــەڵگەڕاوە

(دیلان)

٦- خوێنی پاکی لاوی کوردانە ڕژاوە کێو و کــەژ
بۆیە وا ئێستاکە سوورە، ڕەنگی گوڵناری هەیە!!

(ئەحمەد موختار جاف)

## شەشەم تێهەڵکێش

تێهەڵکێش بریتییە لەوەی شاعیر یان نوسەر ( نیودێر، دێرێک، پەندێک، ئایەتێک ، فەرموودەیەک)، بێدەستکاری وەربگرێت و لەناو دوو کەوانە بیخاتە ناو بەرهەمەکەی خۆیەوە، جا ناوی خاوەنەکەی بهێنێت یان نەهێنێت، نمونە:

جاهیل زلیش بێت وەك کەندوی بۆشە
(دەنگی دەهۆڵیش هەر لەدوور خۆشە)
(پیرەمێرد)

لێرەدا دیارە (پیرەمێرد) پەندێکی پێشینانی تێهەڵکێشی شیعرەکەی خۆی کردووە.

نمونەیەکی تر:

دەمێ کۆچبارەکەت ناچێ لە یادم
دەبێ وەك کوشتمت بشپرسی دادم
(کە بارگەت بۆ هەوار تێك نا عەزیزم
شکا ئەستوندەگی تاولی مرادم)
(هەژار)

(هەژار) دێرە شیعرێکی هێمنی تێهەڵکێش کردووە بێ ئەوەی لە شیعرەکەیدا ناوی خاوەنەکەی بێنێ چونکە دێرە شیعرەکەی هێمن زۆر بەناوبانگە و خوێنەری شیعرەکانی هێمن دەیناسێتەوە.

نمونەیەکی تر:

بۆچی فەرمویەتی نەبیی ئەمین
(اطلبوا العلم ولو بالصین)
(حاجی قادری کۆیی)

لەم دێڕەدا (حاجی) فەرمودەیەکی پێغەمبەری بە دەقی خۆی تێهەڵکێش کردووە، بێئەوەی دەستکاری بکات، یان بیکات بە کوردی.

## سـەرنج

لـەم پێنـج خشـتـەکییەدا بێکەسـی شـاعیر دوو نیوەدێـری (پیرەمێـرد)ی تێهەڵکێشـی شـیعرەکەی خـۆی کـردووە هەروەهـا پێنـج خشـتـەکی بـەر هونـەری تێهەڵکێـش دەکەوێـت.

قــەدری میللـــەتان بەجارێ شــکان
نــە حـــەیاتان مـــا نـــە نــاو و نیشــان
بــارێ تـــەعنـــەتــان واهاتە سەرشان
(وەفدی کوردستان، میللەت فرۆشان
هــەرزە وەکیلی شـــاری خامۆشان)

(بێکەس)

## ڕاهێنان

**لەم دێرە هۆنراوانە هونەری (تێهەڵکێش) دەستنیشان بکە:**

١- (چڵکی دەستە مـاڵی دنیـا) وەك دەڵێـن:
مـاڵپـەرسـت پـەیمان شـکێنە و بێ بـەڵێن
(هێمن)

٢- گـوڵ لـەسـەر لقـی خـۆیا ڕەنگینـە
(بـەردیش لە جێگـای خۆی سـەنگینە)
(پیرەمێرد)

٣- ڕۆژی فـەرمـووت (لیس للانسان الا ما سعـی)
هیچ کەسیش هێندی فەلاح ئیشی کێڵانی نییە
(دڵدار)

٤- لـە دوو ئاوان کـە یـەکدەگری
(سیروانی ئەم چەم تانجەرۆی ئەوچەم)
دوو میسرەعی بەیتی مەولـەوی
بدەن بە یەکدا ئەم چەم بۆ ئەو چەم)
(پیرەمێرد)

٥- سەیری کە ئەڵێی خوێنی ڕژاوی گەشی تۆیە
(سیروانی سروشکم کە ئەکا هاژە لـە سەردا)
عەلی کەمال باپیر( کەمالی )

٦- تا نەتناسی ئایەت و سـەعاتی ئەوقاتی دوعا
فـائیدەی چـی (ربنا انـزل علینا مـائدە)
(صابری)

## وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە

١- یەکێک لەم جۆرە شیعرانە بە گشتی دەبێت بە تێهەڵکێش:

ئ- دوو بەیت  ب- غەزەل  پ- موستەزاد  د- پێنج خشتەکی

٢- چ بابەتێکی ڕەوانبێژی لەم پەندی پێشـــینانە هەیە؟

(دونیـــا ببێتە پۆســـت  دوژمـــن نـــابێتە دۆســـت)

ئ- دژیەک و ڕەگەزدۆزی  ب- خواستن  پ- تێهەکیش  د- لێکچواندن

٣- ئەو هونەرە ڕەوانبێژییەی، کە لە چوار بنەما پێکدێت:

ئ- جوانیی بایس  ب- لێکچواندن  پ- خواستن  د-دژیەکی نەرێ

٤- (پیری بەتەنیا رەحمەتە  ـ  پیری و هەژاری زەحمەتە) ڕەگەزدۆزی ناتەواوە لە :

ئ- ژمارەی (پیت)  ب- جۆری (پیت)

پ- ڕیزی (پیت)  د- ڕیز و جۆری (پیت)

٥- چ بابەتیکی ڕەوانبێژییە ، کە دیاردەیەک هۆی دروست و ڕاستەقینەکەی دەخرێتە لاوە.

ئ- خواستن  ب- جوانیی بایس  پ- ڕەگەزدۆزی  د- لێکچواندن

٦-ڕەگەزدۆزی وەک دژیەک:

ئ- یەک جۆرە  ب- دوو جۆرە  پ- سێ جۆرە  د- چوار جۆرە

٧- لە هەموو بنەماکانی لیکچواندن لە پێشترە، ئەوانی تر بۆ خزمەتی ئەم هاتوون.

ئ- ڕووی لێکچواندن  ب- لەوچوو  پ- ئەوزار  د- لێچوو

٨- ئەم دێرە شیعرە لێکچواندنە:

(کوڕ ئاییـنەیی جەمالی زاتن - کەچ مەظهەرێ پرتەوا سیفاتن)

ئ- یەک بنەمای تێدایە  ب- دوو بنەمای تێدایە

پ- سێ بنەمای تێدایە  د- چوار بنەمای تێدایە.

٩- گڵۆپەکانی سەر جادە و کۆڵان، زەرد هەڵگەڕابوون، کزکز ئەسوتان.
لەم دێرەدا چ بابەتیکی ڕەوانبێژی هەیە؟

ئ- خواستن　　ب- جوانیی بایس　　پ- دژیەک　　د- لێکچواندن

١٠- لەم دێرەدا (مەژی بۆ مردن، بمرە بۆ ژیان - چۆن قازانج ئەکەی، تا نەکەی زیان)

ئ- دژیـــەکی ئەرێ هــەیـە　　ب- دژیەکی نەرێ هەیە
پ- ڕەگەزدۆزیی ناتەواو هەیە　　د- هەرسـێکیان هـەیـە

١١- لەم دێرەدا، چ بابەتێکی ڕەوانبێژی هەیە؟
( ئەم جووتە شێرە دلێرەی شەرزە - لەناو مێژوودا ناویان زۆر بەرزە)

ئ- دژیەک　　ب- ڕەگەزدۆزیی ناتەواو
پ- خواستن　　د- خواستن و ڕەگەزدۆزیی ناتەواو

١٢- لە کام هونەری ڕەوانبێژیدا مەرجە جووت کەوانە هەبێت؟

ئ- جوانیی بایس　　ب- خواستن　　پ- تێهەڵکێش　　د- لێکچواندن



# شێخ سەعیدی پیران
## ١٨٦٨ - ١٩٢٥

شێخ سەعید کوڕی شێخ مەحمودی (کڵدار)ە، لە گوندی (پیران) کە کەوتووەتە سەرووی (دیاربەکر) لەدایکبووە، کڵدار نازناوی بنەماڵەی باوکی بووە، پیاوێکی زانا و نشتمانپەروەربوو، لەگەڵ لاوە خزمەتی کردووە یەکێک لەبەرئەوە کە خەلیفەی (مەولانا خالد) بوو، تەریقەتی (نەقشبەندی) لە کوردستانی تورکیادا بڵاوکردووەتەوە، لەم ڕووە خۆشی بوو، بە شێخێکی پایەبەرز و تا دوانزە هەزار مرید و پەیڕەویکەری هەبوو.

زانایەکی پایە بەرز بوو، گەلێ بڕوانامەی تەدریسی داوە بە فەقێیەکانی لەمانە دوانزە عالمی هەرە گەورە لەو وڵاتەدا دەستێنێژ و (مجاز)ی ئەم بوون.

بە باوەڕی شێخ سەعید حکومەتی ئەو سەردەمەی عوسمانی لە ڕێگای شەریعەتی ئیسلامەوە نەچووە بەڕێوە، ئەمیش بۆهاتنەوە سەرڕێی ئەو حکومەتە و بۆ کەمکردنەوەی

* تابلۆ: هونەرمەند ڕێبوار خالد

ئەو سەرانە و پیتاكانە كە حكومەت خستبوونیە سەر دانیشتوانی وڵات ڕاپەری و نیشتمانپەروەرانی تری كورد دایانە پاڵی، شۆرشی ١٩٢٥- ١٩٣٠ی كوردستان لە وڵاتی باكوری كوردستان هەڵگیرسا، لە ئەنجامدا بەهۆی هەندێ كەموكوڕی سەرنەكەوتن، شێخ سەعید گیراو لەلایەن توركەكانەوە خنكێنرا.

ئەم پیاوە توانی لەو ماوە كەمەی ژیانیدا پێشەوایەكی مێژوویی بۆ نەتەوەكەی خۆی لەو وڵاتەدا بگرێتە دەست. لەپایەی زانیاری و ئەدەبی و هونەریدا كەسی یەكەم بوو لەو ناوچەیەدا بە هۆنراوە، كوردی و فارسی و عەرەبییەكانی سۆزێكی دەدا بە مەردم. پیاوێكی ساماندار بوو. نانەدەر و قۆناغ بوو ئەو پێشڕەوی شۆڕشێك بوو. ناوبانگ و (طریقە)ی مەولانا خالد لە شێخ سەعیدی پیرانەوە لەو ناوەدا دەنگ و ئاوازی پەیداكرد. كۆڕی مەدرەسە و خانەقاكەی وەك پورەی هەنگ وابوو، لە دوولاوە بۆ وەرگرتنی زانیاری ڕێگای (طریق)و شەریعەت ڕووی تێكراوە. ئەو دوو ڕێگایە بوو كە لە ئەنجامدا ڕچەی شكاند بۆ شۆرشی نەتەوایەتی. ئەم سێ ڕێچكەیە كە شێخ سەعیدی پیران گرتبووی بوون بە سێ شارێگە كە مریدان و پەیڕەوانی هەرسێ ڕێگاكە لەپاش خۆیشی لەسەری بڕۆن و شوێن ماڵەگەورە هەر كوێر نەبێتەوەو هەر ئاوەدان بێت.



# میر شەرەفخانی کوڕی میر شەمسەدین بدلیسی ڕۆژکی

شــەرەفخان لــە ٢٠/ زیلقعــدە ســاڵی (٩٤٩)ک داو (١٥٤١) ز لــە شــارۆچکەی (کرهــرود) لەنزیــک شــاری (قوم) لــە دایکبــووە دایکــی کچی میرخــان بوو.

لە (٩) ســاڵیدا لەگەڵ شــازادان لە کۆشــکی شــاهی تۆماســبی ســەفەوی بۆ ماوەی ســێ ســاڵان خوێندوویەتــی، لــە ١٢ ســاڵیدا لەســەر داواکاری هۆزەکەیــان کراوە بەمیــر، چونکە باوکــی گوشــەگیریی هەڵبــژاردووە...... ناردراوەتــە سەرســالیان و مەحمــود ئابــاد لــەلای شــیروانانەوە ..... پــاش ماوەیــەک چۆتە لای خاڵــی کە محەمەد بەگی حاکمــی هەمەدان بوو لــە هەمــەدان ژیــاوە وکچــی خاڵی مارەکردووە. ســێ ســاڵیش لە هەمــەدان ماوە.

لــە هــەرای ســوڵتان بایەزیــدا، کــە پەنــای بۆ شــای ئێــران هێنا باوکــی کرایــەوە میر و گروهرودیــان دایە.... دوای چەند ســاڵێک دیســان باوک بۆ کوڕ دەســتی لــە میرایەتی بەردا.

* تابلۆ: هونەرمەند ڕێبوار خالد

شەرەفخان بۆ ماوەی دوو ساڵ هەمیشە وەک یاوەر و ڕاوێژکارێک لەگەڵ شادا بوو لێی جیانەدەبوو.... بە لەشکر ناردیانە سەر ئەحمەد خانی (بیە)و بەسەر وڵاتەکەی ڕادەگەیشت. سولتان هاشمی حاکمی گەیلان بە ١٨هەزار سوار هێرشی بردە سەر شەرەفخان کە لە چوارسەدو پەنجا سوار پتری نەبوو. لەشکری گەیلانی شکاند و سێ منارەی لەسەریان بەرزکردەوەو گەیلانی گرت و لەپاشان لەسەر خواستی خۆی هاتەوە قەزوین.... دیسان لەسەر خواستی خۆی ناردویانەتە وڵاتی شیروان و ناوچەکانی، تەرکات و ئەرش و ئاق داش و قەباڵە و باکۆ و کەناراوی دراوەتێ کە خۆی و هۆزەکەی پێی بژین. لەپاش هەشت مانگ شا تۆماسب مردووە و ئیسماعیل میرزا بردوویەتییە قەزوین و کردوویەتی بە میری کوردستان و لوڕستان و گۆران و هەر کوردێک کاری بە شای ئێران بووایە دەبوایە لە ڕێگەی میرشەرەفەوە پێیبگات.

دوایی شایان لێی ڕەنجاندووە و ناردوویەتییە سەر نەخچەوان...... ساڵێک و وچوار مانگ حاکمی نەخچەوان بوو تاکو سولتان مرادی سێیەم بە هۆی خوسرەو پاشای میری میرانی وان لێبوردنی بۆناردووە و هاتۆتەوە بدلیس جێگەی باوباپیرانی. ناوچەی موش و چەند جێگەیەکی تری بۆ خراوەتە سەر بدلیس و ساڵانە ٤١٠ هەزار ئاقچەی داهاتبوو.

خۆی دەڵێ: ئەمڕۆکە دوەمین ڕۆژی مانگی قوربانی ساڵی ١٠٠٥ کۆچی و ١٥٩٦زایینییە لە سایەی سەری سولتان محەمەد خانەوە فەرمانڕەوای بدلیس و کاروباری خۆم داوەتە دەست شەمسەدینی کوڕم میرشەرەفخان لە ساڵی ١٠٠٥ کۆچی ١٥٩٦ زایینیدا تەواوبوو لە دانانی کتێبی شەرەفنامە؛ کە مێژووی میرانی کورد دەگێڕێتەوە.



# مەلا محەمەدی کۆیە
# ١٨٧٦ - ١٩٤٣

مەلا محەمەدی کۆیە  بە مەلای گەورە بەناوبانگە، کوڕی حاجی مەلا عەولّای جەلی زادەیە و لە( ١٨٧٦)ز  زاینی لە شاری کۆیە  لەدایکبووە. بنەماڵەی جەلی زادە هەر لە سەردەمێکی کۆنەوە  زانا و مەلا بوون، لە هەموو ڕۆژێکدا  جڵەوی زانستیان لەو وڵاتەدا بە دەست بوو، مەلا محەمەد خۆی هزرێکی ڕوون و ڕۆشنبیرییەکی تەواوی هەبووە. دەتوانرێت لەناو مەلایانی وڵاتی کوردەواریدا بەوە دابنرێت کە پێشڕەوی ڕۆشنبیری بووە، لە ڕووی کاروباری نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتییەوە. لە لاپەڕە پان و درێژەکەی ژیانیدا گەلێک ڕووپەڕی لە ژیانی خۆیدا هەڵگێڕاوەتەوە، هەر لە وانەوتنەوە لە ژووری فەقێیان تا قازییەتی و ئیشی میری، تا ئەندامیەتی ئەنجومەنی دامەزراندنی عیراق. لە ساڵی (١٩٢٨)ز بە تەواوی لە هەموو فەرمانێکی میریی کەناری گرتو ژیانی خۆی بە

* تابلۆ: هونەرمەند ڕێبوار خالد

تەواوی بۆ وانەوتنەوەو کتێب دانان و ڕوناککردنەوەی بیروباوەڕی خەڵک تەرخانکرد، تا لە ژیاندا مابوو ئەمەش ئیشی بوو. کۆیە شوێنی هاتنە دنیایەی بوو مەڵبەندی هەتاهەتایی و کۆچی دوایکردنییشی بوو.

بێجگە لەو ڕێبازانە کە مەلامحەمەدی کۆیە گرتبوونی ئەو ڕێبازەی کە ئاوڕدانەوە لە کچ و ڕێگەدان بەسەربەستیی ئافرەت لە هەموویان گرنگتر و بەسوودتر بوو. مەلا محەمەد لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ئافرەت نیوەی کۆمەڵە و بەبێ دەستیاوی ئەو کۆمەڵە یان ئەو نەتەوەیە پێشناکەوێت. ئافرەت دەبێت ڕێگای خوێندن بگرێت بۆئەوەی لەو ڕێگایەوە بە تەواوی بێتە ناو کۆمەڵەوە و شان بەشانی پیاو بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵ کاربکەن. هەر بۆ سەلماندنی ئەمەش لە ساڵی (١٩٢٦)ز دا هەر کچی خۆی خستە مەکتەبەوە، بەڵکو وتی: دەبێت لە مەکتەبدا لەگەڵ کوڕدا لەسەریەک کورسی دابنیشن بۆئەوە پێکەوە وانەی پاشەڕۆژی نەتەوەی خۆیان و مێژووی نەتەوەکانی تریش بخوێنن.

ئەم هەنگاوەی کە ئەم هاویشتی گەورەترین هەنگاو بوو بۆ ئەو ڕۆژە، چونکە ئافرەت لەو ناوچەیەدا و لەو ڕۆژەدا زۆرتر لە مافەکانی زەوتکرابوو. ئەو هێنای ئەو بیروباوەڕە کە لە دڵیدابوو بەرامبەر بە سەربەستی ئافرەت بەکردەوە پیشانی هەموو کەسێکیدا، ئینجا بە زمانێکی پاراویش هاتە مەیدان و بوو بە لایەنگری سەربەستیی ئافرەت و پڕ بە دەم بانگی کرد و وتی:

ژن زینەتی دونیایە — ئەمانەتی خودایە
حەبیبی مستەفایە — قەڵاتی لە بۆ مێردان

ژن ئەگەر بە حورمەت بێ — بێ زیللەت و زەحمەت بێ
بە تەربیەو ڕەحمەت بێ — دڵ گوشادو لێوخەندان

کوڕی دەبێ وەکی شێر — عاقڵ و دانا و دلێر
بەدڵ غەنی بە چاوتێر — سەردارو مەردی مەیدان

دەرحەق ژنان بێ باکن — بۆیە بێ داکی چاکن
سەیری حاڵی خۆ ناکەن — وەك دڕکن لە نێو عەردان

ژنیش وەك مـوزەكـــــەرە عەینەن ئەوەیـش بەشــەرە
چــاو لادانی لـــەســـــەرە هەردوو لەیەك حوكمـدان
وەزیـفـــەی زۆر گــەورەیـــە دەزانـــی ئـــەوەیـش چییە؟
منـداڵ بــــوون و تــەرییـــە بێ مەسخەرە و جـوێن پێدان

تەماشـا دەكەیـن مـەلا محەمـەدی كۆیـە چ بە كـردەوە چ بە وتـن بوو بەو كەسـەی كە بـە پەنجـە لە بـارەی داواكردنـی سەربەسـتیی ئافرەتەوە بـە جۆرێک هێمای بـۆ بكرێت كە لــە دوای خـۆی ئەو كـردەوە و ئامۆژگارییەی بـوو بە جێگای پەیـڕەوی كردن......



# قـەڵای دمـدم

شـەڕی قـەڵای دمـدم لـە سـەردەمی فەرمانڕەوایـی شـا عەباسـی یەکەم شـای ئێرانی لـە سـاڵی (١٦٠٨)ز ڕوویـداوە. مێژوونووسـی شـا عەباس کە نـاوی ئەسـکەندەر تورکمان بـوو وەک پەیامنێرێـک لـە جەنگەکـەدا بەشـداربوو، لەپاشـاندا زانیارییێکـی زۆر بەکەڵکـی لـەم بابەتـەوە لە کتێبـە بەناوبانگەکەی (مێـژووی عالەم ئارایـی عەباسـی)دا تۆمارکردووە. مێژوونووسـی کـوردی بـە ناوبانگیـش مەحەمەد ئەمیـن زەکـی زۆر ڕوداوی بەنرخی تری لەبـارەی قـەڵای دمدمەوە لە (مێـژووی کـورد و کوردسـتان)دا بڵاوکردووەتەوە.

لـە سـەدەی شـازدەهەم و سـەرەتای حەڤدەهەمـدا خانـی لەپزێڕیـن میـری ناوچەکانی تەرگـەوەڕ و مەرگـەوەڕ و ئورمـێ و شـنۆ بـوو لـە خۆرهەڵاتی کوردسـتان و سـەرۆکی هۆزەکانـی برادۆسـتیش بـوو. خانی لەپزێرین لە جێگەی پاشـماوەی قەڵا هـەرە کۆنەکەی دەوروبـەری ساسـانییان کـە نـاوی دمدم بـوو قەڵاییێکی سـەختی تـازەی دروسـتکرد، بۆ

زیاتـر بەهێزکردنـی قـەڵای دمدم، لە نـاوەوە قەڵایێکی بچوکـی تری دروسـتکرد و ناوی نا (نارین).

بەهێزکـردن و پتەوکردنـی قـەڵای دمـدم کارێکـی گـەورەی کردە سـەر میرنشـینەکانی هاوسـێی خانـی لەپزێریـن، ئەمانـە کەوتنـە هاندانـی شـای ئێران لـە دژی خـان بۆئەوەی هێـزی خـان زیاتـر پەرەنەسـێنێت و لـە دواڕۆژێکـی نزیکـدا جـاڕی سـەربەخۆیی نەدا.

هـەر لـەو کاتـەدا بـوو بیسـت بـۆ هـەزار کـەس لـە هـۆزی جەلالی لـە کوردسـتانی عوسـمانییەوە کۆچیـان کـردە خۆرهەڵاتـی کوردسـتان. ئەمـە هەلێکـی بەنرخ بوو بۆ شـا و بڕیاریـدا کـە هەزار کەسـیان لە ناوچەی برادۆسـت جێنشـین بـن. بەڵام خانـی لەپزێڕین بـە تونـدی لـە دژی ئەم بڕیارەی شـا وەسـتا. شـا عەباس لەشـکرێکی قـورس و بەهێزی نـاردە سـەر خـان، بـەڵام کـوردەکان بڕیاریاندا کە تـا تاقە کەسـێک لە جەنـگاوەری کورد بمێنێـت قەڵاکـە بەدەسـتەوە نـەدەن. بەم جـۆرە کوردەکان بۆمـاوەی چوار مانـگ بەرگری قـەڵا خۆشەویسـتەکەیان کـرد. دوژمن لەتوانایـدا نەبوو بەسـەر کوردەکانـدا زاڵبێت، بەڵام وەک قسـەی نەسـتەقی کـورد دەڵێـت ( دار پـوازی لـە خۆی نەبێـت ناقڵیشـێت)، کوردێک تاوانێکـی گـەورەی کرد بەوەی سـەرچاوەی کانیاوەکەی قەڵای دمدمی بە لەشـکری دوژمن پیشـاندا، ئەمـە بـوو بـە هـۆی قڕبوونـی هەمـوو جەنگاوەرانی قـەڵای دمدم، بـەڵام دەبێت ئـەوەش بزانرێـت کـە کـوردەکان قەڵایان بـۆ دوژمن بەجێ نەهێشـت تـا دوا جەنگاوەریان شـەهیدبوو. لـە سـەرەتای سـەدەی حەڤدەهەمـەوە تـا ئەمـڕۆ پاڵەوانیەتـی جەنگاوەرانـی قـەڵای دمـدم لەسـەر زاری گۆرانـی بێـژ و حەقایەتخوانـی کوردە، لـە هەمـوو ناوچەکانی کوردسـتان و بـە هەموو شـێوەزارەکانی زمانـی کوردی.

ئـەو ئەدەبـە فۆلکلۆرییـەی کـە لـە ئەنجامـی جەنگی قـەڵای دمدمـەوە کەوتـەوە زۆرە، هەندێکـی بڵاوکراوەتـەوە، بەشێکیشـی تـا ئێسـتا هـەر لەسـەر زاری خەڵکـی ماوەتـەوە. لەلاییێکـی تـرەوە ئەگەر بەراوردێک لەنێوانـی هەوڵ و تەقەڵای خۆمان و خۆرهەڵاتناسـەکان بکەیـن، بـۆ ئـەم کارە دەبینین کە خۆرهەڵاتناسـەکان لە ئێمـە زیاتر بایەخیان بـە حەقایەت و بەیتەکانـی قـەڵای دمدم داوە، نـەک تەنیـا بڵاوکردنەوەیان بە کوردی بەڵکو گۆڕینیشـیان بـۆ زمانی ڕوسـی و ئەڵمانـی و فەرەنسـی و ئەرمەنی.

شـەری قـەڵای دمـدم تەنیـا ڕەنگی لـە فۆلکلۆری کـوردی نەداوەتـەوە: بەڵکو بـووە بە سـەرچاوە بـۆ دانانی چیـرۆک و ڕۆمانی کوردیش، بۆ بەڵگە نووسـەری کوردی سـۆڤیەتی بەناوبانـگ عـەرەب شـەمۆ (عـەرەب شـامیلۆڤ) لەبـەر ڕۆشـنایی ڕوداوە مێژووییەکانـی قـەڵای دمـدم ڕۆمانێکی نووسـیوەتەوە. ئەم ڕۆمانە سـاڵی ١٩٦٦ بە زمانی کـوردی و پیتی ڕوسـی (سـلاڤی) لە شـاری یەریڤانی پایتەختی ئەرمەنسـتانی سـۆڤیەت بڵاوکراوەتەوە، لە پاشـاندا وەرگێڕدراوە بۆ زمانی ڕوسـی و سـاڵی ١٩٦٩ لە مۆسـکۆ بڵاوکرایەوە.

عـەرەب شـەمۆ لـە ڕۆمانەکەیـدا هەوڵـی داوە پەیوەنـدی دۆسـتایەتی کـورد و نەتەوە هاوسـێکانی ڕوونبکاتـەوە، بەتایبەتـی خەباتـی ئەم میللەتانـە لە دژی داگیرکـەری ئێرانی و عوسـمانی. هەروەهـا وێنـەی نایابی ژیانـی کۆمەڵایەتی و ئابوری کوردسـتانی کێشـاوە لە سـەرەتای سـەدەی حەڤدەهەمدا.

ڕوداوەکانـی جەنگـی قـەڵای دمـدم سـەرچاوەیێکی بەکەڵکـن بـۆ دروسـتکردنی گەلـێ بابەتـی نووسـین و هونـەر، وەک چیـرۆک و پیەسـی پەخشـانی و شـیعری، هەروەهـا کەرەسـتەییێکی بـێ هاوتای شـانۆ و سـینەمایە، بـەڵام لەبـەر دەسـتکورتی نەتەوەکەمان تا ئێسـتا هەلێکـی وامان بـۆ هەڵنەکەوتووە کە ئـەم ئامانجـە بهێنینەدی. دەبێت ئـەوەش بڵێین کـە سـاڵی ١٩٣٨ تیپـی نواندنی ئاشـورییەکانی سـوریا بە زمانـی عەرەبی قـەڵای دمدمیان خسـتبووە سـەر شـانۆییێکی گەڕۆک و لە هەندێ لە شارەکانی سـوریا پێشکەشیان کردبوو.

# سەرچاوەکان


١. زمـــان و ئەدەبی کوردی ـ بۆ پۆلی شەشـــەمی ئامادەیی چاپـی هەولێر ٢٠٠٢ز ـ ٢٧٠٢ کوردی.

٢. د. ئاورەحمانـــی حاجـــی مـــارف، ڕێزمانـــی کـــوردی بەشـــی (١-٥) کۆکردنـــەوە و لـــە چاپدانەوەیـــان لە یـــەك کتێبدا ســـلێمانی ـــــ ٢٠٠١

٣. نوری علی امین، قەواعدی زمانی کوردی لە (صرف نحو)دا، بەغداد، ١٩٥٦.

٤. د. کوردســـتان موکریانی، سینتاکسی ڕســـتەی ســـادە لە زمانی کوردیدا، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی زنجیـــرە ژمارە ١٣٣.

٥. نوری علی امین، ئەرك و شوێنی ڕاناوە کەسییەکان لە ئاخاوتنی کوردیدا ١٩٨٦.

٦. دیوانی شاعیرە کوردەکان.

٧. گۆڤـــاری (گەلاوێژ، ڕۆژی نوێ، هیوا، نووســـەری کـــورد، کۆڕی زانیـــاری، (المعلم الجدید) و ئەوانیتر.....)

٨. نووسینەکانی سەجادی، خاڵ، شاکر فتاح و گۆران.

٩. کتێبی خوێندنەوەی عەرەبی بۆ پۆلەکانی قوتابخانە بنەڕەتی و ئامادەییەکان.

١٠. مختصری صرف نحوی سعید صدقی.

١١. دەستوری زمانی کوردی تۆفیق وەهبی.

١٢. ڕێزمانەکانی نوری عەلی ئەمین.

١٣. زاراوەکانی کۆڕی زانیاری.

١٤. الواقعیه في الادب الکردي الدکتور عزالدین مصطفی رسول.

١٥. دوکتور مارف خەزنەدار سەرەتای مێژووی ئەدەبی کوردی (بەڕوسی).

١٦. محمد عارفی جزیری - سگڤان عبدالحکیم - ١٩٨٤- بغداد

١٧. گۆڤاری سلێمانی ژ (٩)ی ساڵی ١٩٦٩ - د. شوکریە ڕەسول -١٩٨٩ – هەولێر

١٨. المدخـــل لدراســـه الادب الکردي المـــدون باللهجه الشـــمالیه ـ جـــزو الاول - تحســـین ابراهیم الدوســـکی -١٩٩٣.

١٩. ڕۆڵـــی گۆڤاری هیوا لـــە پێشخســـتنی هونەرەکانی ئەدەبـــی کوردیدا - نامەی ماســـتەر ـ هیمداد حســـین بکر - ١٩٩٥

